لەبڵاوکراوەکانی
یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان
ژمارە ( ٤ )

# دەقەکانی کۆنگرەی سیڤەر

# و

# خوێندنەوەیەکی تر

وەرگێڕانی لەزمانی ئینگلیزییەوە
سەلام ناوخۆش

خوێندنەوەی
مسعوود عبدالخالق

دەقەکانی کۆنگرەی سیڤەر و خوێندنەوەیەکی تر

٢٠٠٩

# هەرکاتێ لەسەر مافی چارەی خۆنوسینی کوردستان کار بکرێ دەبێ ڕێکەوتننامەی سیڤەر بێتەوە گۆرێ .

**یەکیتی پەرلەمانتارانی کزردستان**

## لە بڵاوكراوەكانی یەكیتی پەرلەمانتارانی كوردستان
## ژمارە ( ٤ )

**ناوی كتێب:** دەقەكانی كۆنگرەی سیڤەر و خوێندنەوەیەكی تر

**وەرگێڕانی لەزمانی ئینگلیزییەوە:** سەلام ناوخۆش

**خوێندنەوەی:** مسعوود عبدالخالق

**نەخشەسازی ناوەرۆك و بەرگ:** ئەبوبەكری مەلا عەبدوڵڵا

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**چاپ:** چاپخانەی منارە — **هەولێر**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردن (٦٥٤)ی ساڵی (٢٠٠٩)ی پێی دراوە

# پێشەكی

بەدرێژای مێژوو ئەوەندەی كێشە لەسەر خاكی كوردستان هەبووە ئەوەندە لەسەر كورد وەك كێشەیەكی نەتەوەیی و گەلێك نەبووە ، ململانێكان لەسەر خاكی كوردستان یەكلابوونەتەوە ئەم كێشانە نە بە ویست و خواستی كورد سەری هەڵداوە نە ئەنجامەكەشی لەبەرژەوەندی ئەوبووە ، كاتێكیش كورد بە دەنگ هاتبێ بە مایەی سەر یەشە و لادان لە فەرمان لە قەڵەم دراوە، ئەوەی هەمیشە لە ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی كوردەواری خۆی دووبارە دەكاتەوە مێژووە ، هەرچی شكست و نەهامەتی و كارەساتەكان دەخاتە ئەستۆی بەرامبەرەكانی بێ ئەوەی هیچ بەرپرسیاریەكیش هەڵبگرێ ، سەرەڕای ئەمانەش زۆر كەم پشت بەخۆی ، بە تواناكانی ، بە وەرگرتنی ئەزموونەكانی دەبەستێ زیاتر ئیتیكالیە ، ئەمە نەخۆشیە (نەخۆشی دەردە كورد) ، ئەگەر دەردەكەش زانرا هەقە دەرمانیشی بۆ بدۆزرێتەوە بە مەبەستی چارەسەركردن ، بە گشتی زۆر دەگمەنە خوێندەوارێكی كورد ناوی (پەیمانی سیڤەر)ی نەبیستبێ دەگمەن تریش لەمە ئەوەیە خوێندنەوەیەكی دروست لەسەر دەقەكانی (سیڤەر) لەبەر دەست نەبێ ، تەنیا وا دەزانێ مادەكانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) پەیوەندی بە كوردەوە هەیە ئەویش لە (پەیمانی لۆزان) زیندە بەچاڵ كراوە .

مخابن ئەو نەریتەی كە هەمیشە خۆمان لە بەرپرسیارەتی دەكشێینەوە یان ڕا دەكەین ئەوەیە زۆربەی مێژوونووسان و ئەوانەی بەدووادا چوونیان هەیە وەك ئەوەیە كوردایەتی بكەن ، ڕاستیەكان و دیكۆمێنت و نهێنی و شاراوەكان بە بەڵگەوە ناخەنە ڕوو بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەستن بە كێشە و ناكۆكیەكان و ناچنە ناو بنج و بنەوانی مەسەلە هەستیارەكان ...

كارەسات لەوە دایە گەلێك ئەگەر مێژووی خۆی لێ بشێوێنرێ میللەتێكی سەر

لێشێواوی لیَ دەردەچیَ ، شانازی و شەرمەزاریەکانی پیَ لێك ناکرێتەوە ((نە دەبێتە میراتگری دوێنیَ و نە خاوەنی ئایندەیەکی گەش ، هەمووی کراوە بە قوربانی کێشە کۆمەلاّیەتیەکان پشتا و پشت نەوەکانی میللەتەکەمانی پیَ سەرچیغ (سەرەڕۆ) بردووە، کەی دێینەوە هۆش خۆمان ، ئەوە چ لە ئێستا زوو تر نیە !))

ئەوەی کە دەبوایە لە دووای ڕاپەڕنی (١٩٩١) بکریَ کاری هەڵسەنگاندن و شرۆڤە و لێکدانەوە و توێژینەوەی زانستی و پلاندانانە سەبارەت بەخۆدا چوونەوە لەسەر هەموو تەوەرەکان بۆ ئەوەی بناغەیەکی پتەو دابڕێژریَ و ژیانی کۆمەلگەی کوردستانی پیَ دروست بکرێتەوە واتە کۆمەلگایەکی بڕوا بەخۆبوون نەك چاو لە دەست ئەم و ئەو ، دەرکردنی ئەم کتێبەی لەبەر دەستدایە گرنگیەکەی لەوەیە کە قەلەم ڕەنگینمان ، ویژدان پەروەرانمان ، ڕووناکبیران و دەسەلاّتە شەرعیەکانی کوردستان هەلّمەتی هەلّسەنگاندن و خوێندنەوەی تر دەست پیَ بکەن گۆڕانی پێویست بخرێتە گەڕ ، ئەمەش نەخشە ڕێگایەکی پتەوی دەویَ ، ئامادەکاری باشی بۆ بکریَ بزانریَ کیَ یە گۆڕانکاری دەکا و لەسەر چی و بۆچی ، ئامانجەکە ڕوون بیَ بۆ ئەوەی ئەنجامێکی چاکی لیَ بکەوێتەوە ئەوسا پێداگرتن لەسەر گۆڕان و ڕیفرۆم و چاکسازی ڕاستە ڕیَ دەبیَ ، ئەگەر بمانەویَ ئەم بەرنامانە ئەنجام بدریَ پێویستی بە کەرستەی باش و زانستی هەیە بۆ ئەوەی بتوانریَ هەلّس و کەوت لەگەلّ ڕابردوو و ئێستا و ئایندەدا بکریَ .

ڕابردووی هەر نەتەوەیەك بەشێکە لە مێژووی دوور و درێژی خۆی گرنگ ئەویە چۆن لە دەرگای مێژوودا بدریَ ، بەکیَ و چۆن و ئا مانج لەو دەرگا لێدانەش چی یە ، وەك نموونە دەکریَ لەم کتێبەی لەبەر دەستدایە بەووردی ئەم پرسیارانە ڕوونتر بکرێتەوە بۆ ئەوەی وەلاّمێکمان دەستکەویَ ، کاتێك ئەم پڕۆژەیە لەلایەن هەردوو بەڕێزان (مامۆستا سەلام ناوخۆش و کاك مەسعود عبدلخالق) ڕووبەڕووی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان کرایەوە دوای چەندین کۆبوونەوەی هەردوو لا نەك هەر بە پێویست زانرا بەلّکو وەك ئەرکێکی نەتەوەیی بەشداریمان لە جیَ بەجیَ کردنی ئەم پڕۆژەیە

ڕاگەیاندن ، کەوتینە بیروڕا گۆڕینەوە و شیکردنەوە و لێکدانەوەی ، ئامانجەکە بریتی یە لە و ەرگێرانی ڕاستەوخۆ لە زمانی ئینگلیزی بۆ سەر زمانی کوردی دوایش خوێندنەوەیەکی تر لەسەر بەندەکانی (پەیمانی سیڤەر) ئێمەش لە یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان لەگەڵ بەڕێز کاك (حەمەعەلی تۆفیق) جێگری سەرۆکی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان پێداچوونەوەیەکی وورد و بەسوودمان لەسەر کرد چ لە ڕووی دەوڵەمەند کردنی بە هەندێ سەرنج و تێبینی چ لە ڕووی ڕێنووس و زمانەوانی و پوختەکردنی داڕشتنەکان تا ئەو ئاستەی پێمان کراوە دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئەو نرخە گەورەیەی دەردەکەوێ کە ببێتە کتێبی هەمووان لە کتێبخانەی ڕۆشنبیران و کتێبخانە گشتیەکان و ئەکادیمیەکان دابنرێ ، بە کورتی هەقە هەموو خوێندەوارێك ئەم کتێبە بخوێنێتەوە لەبەر چەندین گرنگی یاسایی و سیاسیی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی :

- ئەو ڕێکەوتنامەیە (سیڤەر) هەرچەند هێزی سیاسیی نەماوە بەڵام هێزی یاسایی خۆی لەدەست نەداوە .
- ئەوە دەردەخات باشوری کوردستان (ویلایەتی موسل) لەگەڵ عێراق یەك پارچە نەبووە ئەو کاتەی کە لە دەسەڵاتی عوسمانی جیاکراوەتەوە .
- وەرگێرانی لە زمانی ئینگلیزی ڕاستەوخۆ بۆ سەر زمانی کوردی ئەو هەڵە و ناڕاستیانەی وەلا ناوە کە بەئەنقەست لە کاتی وەرگێرانی بۆ سەر زمانەکانی تر بە تایبەتی تورکی و عەرەبی دەستکاری کراوە .
- مەسەلەی کورد چووەتە نێو ڕێکەوتنامەیەکی نێو دەوڵەتی .
- پڕ چەك کردنی بە بەڵگەنامە و زانیاری وورد ، نرخ و بایەخی زۆری هەیە بۆ ئەوانەی بەدوواداچوون دەکەن .
- وەڵامدانەوەیەکی یاسایی دەدا بە دەستەوە کە (پەیمانی لۆزان سیڤەری) هەڵنەوەشاندەوە .

- یەکەمجارە بەم شێوەیە لە (پەیمانی سیڤەر) بکۆڵێرێتەوە تەنیا وا باوە مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) پەیوەستە بە کورد و کوردستان .
- ئەگەر نەخشەی ڕێگای دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دابنرێ دەبێ لە سیڤەرەوە دەست پێ بکرێ .
- ڕاستکردنەوە ی هەندێ هەڵە و هەڵوەشاندنەوەی چەندین هیواو و بۆچوون .
- ڕاستیەکان خۆیان دەدوێن .
- ناسینەوەی ڕەوشت و ئاکار و نەریتی کوردانەمان و کاریگەریی لەسەر چارەنووسی نیشتیمان .
- دەرکەوتنی دۆستان و ناحەزان .
- ئەوە دەدا بە دەستەوە یەکێك لەو گەلانەی لە میراتی عوسمانی بێ بەشکرا کورد بووە کە هەقێکی شەرعی خۆی هەبوو بۆیە کورد دەتوانێ تاپۆی مولکی خۆی لە (سیڤەر) بدۆزێتەوە .
- سیڤەر بنەمایەکی بایەخدارە ئەگەر بێت و کاری لەسەر بکرێ بە دیالۆگ و ڕێگەی چارەسەری لەگەڵ گەلانی دەوروبەر قسە و باسی لەسەر بکرێ وەك پێشینەیەکی بەڵگەداری نێو دەوڵەتیە .
- ئەم ڕێکەوتنامەیە لە ڕێگەی ناوەندێکی کاریگەر (لوبی) گیانێکی سیاسی و یاسایی و مێژوویی لەبەر بکات تەنیا بۆ مەرامە ئەسڵیەکەی کاری لەسەر بکرێ .
- ئەوە دەخاتە ڕوو کورد بە پێ ی بناغەکانی سەردەمی سیڤەر هەقی دامەزراندنی دەوڵەتی هەبووە ئەمەش لە دواییدا بەپێ ی یاسای نێو دەوڵەتی (١٩٢٩) مەرجی بە دەوڵەت بوونی ((هەرێم + گەل + دەسەڵاتی سیاسی)) پێناسە کراوە

- سـیڤەر ئـەوە دەردەخـات کـورد پەرتـەوازە بـووە هـەلێکی گـەورەی نەقۆزتوەتەوە هەرچەند خاوەنەکانی (سیڤەر)یش وەك پێویست بۆ مافـەکانی کورد هەنگاویان نەناوە .

سەرەڕای ئەم گرنگیانەی کە لەسەرەوە ئاماژەی پێدراوە بەڵام نـاوەڕۆکی (سـیڤەر) چ لە پێش (لـۆزان) و چ لـە دووای (لـۆزان) لـە چوارچـێوەی خـودی (سـیڤەر) نەچـوەتە دەرەوە لە ناو دەسـتوری ئـەو دەوڵەتانـەی کوردسـتانیان لەسـەر دابەشـکراوە ، مـافی دەسـتوری وەرنـەگرتووە دووای چـەند سـاڵێکی کـەم لـە دووای (سـیڤەر و لـۆزان) دیبلۆماسی کوردی ڕۆڵێکی ئەوتۆی نامینێ مەسەلەی کورد سەرەڕای سەرهەڵدانەوە لە چـەند کـات و شـوێنی جیـا جیـا وەك مەسـەلەیەکی لـە بیرکـراو لـە نێـو سیاسـەتی نێودەوڵەتی هەڵپ ەسێردراوە بە جیدی نەبووە بە ئەجیندەی مەسەلەیەکی نێو دەوڵەتی ڕاستە کورد بە درێژایی سە دەی بیست وازی لە جموجۆڵی بەرگری و سیاسی نـەهێناوە بەڵام هەرگیز لە نێو دیبلۆماسی نێو دەوڵەتی گەرم و گوڕی بەخۆیەوە نەبینیووە .

بۆیـە سـەرەنجام ئـەوە گرنگـە ئێـستا لـە دووای خۆسـەپاندنی مەسـەلەی کـورد لـە گۆڕەپانەکانی کارکردنی نێو دەوڵـەتی دوای کارەساتەکانی ئـەنفال و کیمیابـارنکردنی خـەڵك و خاکەکـەی بـە تایبـەتی دووای بڕیـاری (٦٨٨) هـەروەها بەشـداریکردنی لـە پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق لە ڕژێمی دیکتـاتۆری (٢٠٠٣) کـورد و سنوری کوردسـتان هاتـەوە نێـو سیاسـەتی نێـو دەوڵـەتی ی و دیبلۆماسـی جیهـانی ی و نێـو کـۆڕ و کۆبوونەوەکانی (un) و ڕێکخراوەکانی ، بۆیە ئێستا ڕۆژی ئەوە هاتوە کە لە (سیڤەر) ڕا دەست پێ بکرێتەوە ، پاڵپشتی هەموو ئەو گۆڕنکاریانەی کە لە بەرژەوەنـدی گـەلی کورد دایە ئەم هەوڵەش بێتە دەرفەتی دەسکەوتەکان نەك لە دەست دان .

لـەژێر کـارتێکردنی کـۆنگرەی سـیڤەر پـرۆژە یاسـای خودموختـاری (ئۆتۆنـۆمی) کوردسـتانی لێکەوتـەوە کەلەدانیـشتنی ڕۆژی ١٠ ی شـوباتی ١٩٢٢دا ئەنجومـەنی نیشتمانی گەورە گفت و گۆی لەسەر کرا ((بڕوانە گۆڤاری یاسا ژمارە (٥) ساڵی ٢٠٠٠ طارق جامبان)).

پڕۆژەی ناوبراو وەك لەهەندێ بەندو بڕگەكانی هاتووە:

١. دامەزراندنی دەزگای ئیداری خودموختاری بۆ خەلكی كورد گونجاو بێ لەگەڵ ڕێو ڕەسمی نەتەوایەتیان.

٢. هەڵبژاردنی فەرمانداریێكی گشتی بۆ ئەو ناوچانەی زۆرینەی كوردن.

٣. پێكهێنانی ئەنجومەنی نیشتمانی كورد لە ویلایەتەكانی ڕۆژهەلات كە ئەركە هەمە لایەنەی دەبێ.

٤. دروست كردنی دەزگای قەزایی كوردستان.

٥. ئەنجومەنی نیشتمانی كورد پەیرەوی ناوخۆی هێزی جەندرمە بۆ پاراستنی ئاسایش لە ویلایەتەكانی ڕۆژهەلات ڕێكدەخات.

٦. تەنیا زمانی توركی رەسمی دەبێت دەتوانرێ لە خوێندنگاكان زمانی كوردی بە كاربهێنرێ و پەرەی پێبدرێ.

٧. ئەنجومەنی نیشتمانی كورد زانكۆیەك دادەمەزرێنێ كە كۆلێژی ماف و پزیشكی تێدابێت.

لەگەڵ چەندین بەند و بڕگەی تر ، كەچی نوێنەرانی كورد كە (٧٢) ئەندام پەرلەمان بوون هەندێكیان بە جۆش و خرۆشەوە لە دژی ئەم پڕۆژەیە وەستان ، لەلایەكی تریش ( ئێدمۆندز ) لە موحازەرەیەكدا لە ١٩٦٦/١٠/٢٥ لە لەندەن دەڵێ : پێش كۆنگرەی سیڤەر لە ساڵی ١٩١٨، هاوپەیمانان دانیان بە ئاواتە نەتەوەییەكانی كەمینەكانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە چوار چێوەی خاڵی (١٢) ی دەقێ پرەنسیپە جیهانیەكانی سەرۆك ویلسن دانا ، كە تێدا هاتووە:

كەمینە نا توركیەكان لە ناو چوار چێوەی ئیمپراتۆری دەبێ دەرفەتێكی ئازادی ڕاستە قینەی دور لە هەرچەشنە دەستێوەردان و كاریگەری بۆ برەخسێت تاسەر بە خۆیی خۆی بە كار بهێنێ ، دەقی مادەی (٢٢) لە بەڵگەنامەی گەلان (عصبە الامم) جەخت بۆ هێنانە دی ئەو دەرفەتە لە ڕێگەی هێنانەدی سیستەمی ئینتداب دەكات.

ئەم پرانسیپە ئازادانە كۆمەلە شێوەیەكی دیاریكراوی لە پەیمانی سیڤەردا بە بەرداكرا

کەلەلایەن هاوپەیمانەکانی سەرکەوتوو لە ساڵی ١٩٢٠ بە سەر (هادی پاشا) سەپێنرا ، کە ئەمەش سێ دە وڵەتی عەرەبی لە حیجاز و سوریاو عێراق و دەوڵەتێکی ئەرمەنی لە تورکیای ڕۆژ هەلأتدا و هەروەها دەولّتێك بە ناوی کوردستان لە ویلایەتە کوردیەکانی تورکیا کە کوردەکانی ویلایەتی موسلیش مافی چونە پاڵ ئەم دەوڵەتەیان بە ئازادیەکی موتڵەقەوە (ڕەها) هەبێ دایمەزرێنن ، ئەو بەیانەی لە سەرو بەندی دانوستاندنەکانی لۆزان لە کانونی یەکەمی ١٩٢٢دا لە لایەن حوکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی ی و حوکومەتی عێراق بلأو کراوەتەوە لە بەر گرنگی و روونی ی و برینەوەی ((بیان هام و واضح و جازم)) ئێدمۆندز لە موەحازرەکەیدا چەند سەرنجێك لەو بەیانەدا دەخاتە ڕوو .

١. بەکارهێنانی رستەی حوکومەتی کوردی مەودایەکی دوور تری لە ئۆتۆنۆمی لە چوار چێوەی کۆماری عێراقدا هەیە کە ئێستا داخوازیەکی رەسمی کوردەکانە.
٢. رستەی لە چوار چێوەی سنورەکانی عێراقدا لە بڕی برگەی (ئەو کوردانەی لە چوار چێوەی سنوری ویلایەتی موسلی عوسمانیدا دەژین بەکار هاتووە) .
٣. بانگهێشتی کوردەکان بۆ دیاریکردنی ئەو سنورانەی کە بۆ حوکومەتی کوردی بە گونجاو دەزانن.

لەسەر تەواوی ئەو بەلێن و بەیاننامە و رێکەوتن و کۆنگرانەی بەکورد دراوەو یان کێشەی تاوو توێ کراوە جێگەی داخە ئەمانە زۆربەیان بە خێرایی لەبیر چوونەوە ، کەوتنە بەر هەل و مەرجی تەنگژەو هەلّوێستە گەلێکی سەخت لەگەڵ خۆیاندا لوول دران ، لە کۆتاییدا ئەمە راستیەکی مێژووییە دابەشکردنی کوردستان بەزۆر سەپێنراوە بەبێ ویست و خواستی گەلەکەی لە ژێر کاریگەری جەنگی جیهانی یەکەم و گۆرانکاری لە سنورەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی ، دەکرێ جارێکی تر ئەم هاوسەنگی و پەیوەندیە نێودەولەتیەکان و لە گەڵ سووربوونی گەلی کوردستان بەرەو یەکگرتنەوەی

کوردستانی گەورەمان ببات ، وەك ئەوەی لە چەندین شوێنی جیهاندا روویاندا، (ڤێتنــام ، ئــەلمانیا) یــاخود بــە لێکدانەوەیــەکی تــر هەڵوەشــاندنەوەی ســنوری ئــەو دەولەتانەی کە کوردستانیان لە سەر دابەشـکراوە وەکـو لـە یـەکێتی سـۆڤیەتی پێـشو رویدا یان لە یوغسلافیا و چەندین وولاتی تر. هـەر کامـەیان بـێ لـە بەرژەوەنـدی گـەلی کوردستاندایە ئـەو گەلـەی رۆلی لـە مێـژوو دا دیـارە دەیـەوێ بـە رێگـەی دێمـوکراتی و ئاشتی ی و دیالۆگ نەخشە و ناسنامەی خۆی هەبێ چ زوو چ درەنگ ئەو مافـە بـەڕەوا دەزانێ.

نیعمەت عەبدوڵلا

**بەشی یەکەم:**

# خوێندنەوەیەکی تر
# بۆ پەیماننامەی سیڤەر

**مسعوود عبدالخالق**

# پێشەکی

خاوەن هەق بۆ گێڕانەوەی مافی خۆی بەدوای هەر بەڵگە و سەنەدێك دەگەڕێت ، هەتا ئەگەر شاهێدێکی زارەکیش بێت ، لەو سۆنگەیەوە ئێمەی کورد خاوەنی دەیان بەڵگەنامەی بەهێزین کە بە سانایی دەیسەلمێنێ مافی چارەنوس و بوون بە دەوڵەتمان هەیە بەپێی یاسای نێودەوڵەتی و شەریعەتی ئیسلامیش ، بۆ زەقکردنەوەی ئەو مافە تێکۆشینێکی هەمەلایەنی دڵسۆزانەی دەوێ ، هەر لە شۆڕش و راپەڕین تا دەگاتە نووسین و دۆزینەوەی بەڵگەنامەی یاسایی ، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین رێکەوتننامە و بەڵگەنامەی مێژوویی هەیە کە بە ئاسانی دەتوانین پشتی پێ ببەستین و بیکەینە بنەماکانی یاسایی بۆ بەچارەنوس گەیشتن ، لەوانە:

رێکەوتننامەی سوڵتان سەلیمی قانونی و ٢٣ میرنشینی کورد لەژێر سەرپەرشتی شێخ ئیدریسی بەدلیسی لە ١٥١٤ کە بەهۆیەوە سیستەمی خەلافەت و لامەرکەزی و ویلایات چەسپا ، هەروەها ئاماژەکانی کۆنگرەی بەرلینی ٢/ یۆلیۆ/ ١٨٧٨، بنەماکانی جامیعەی ئیسلامی ، ئینجا کۆنگرەی پاریسی ١٩٠٢،...تادەگاتە بنەماکانی مافی چارەنوس لە ١٤ خالەکەی ویلسن لە ساڵی ١٩١٨ ولێدوانە هاوبەشەکەی بریتانی – فرنسی لە ١٩١٨ ، کۆنگرەکانی سان ریمۆ وسیڤەر لە ١٩٢٠، پێدانی مافی چارەنوس لەلایەن سولتانی عوسمانی ، ڕاپۆرتی لیژنەی نێوبژی ویلایەتی موسل لە ١٩٢٥،...تا دەگاتە مادەکانی (١) و (٥٥)ی میساقی نەتەوەیەکگرتوەکان ، لەگەل زۆر لای تری پڕشنگدار کە هەمووی لێرە نانوسرێ .

ئەو دارشتنە یاساییانە وا پێویست دەکا بە زانستی و مێژووی خۆماندا بچینەوە کە بە هەڵە کۆمەڵێك چەمك چەسپیوە، لەوانە:

١– دەڵێن کورد لەساڵی ١٥١٤ وە داگیر و دابەشکراوە ، کەچی لە راستیدا وانیە ، کورد سەربەخۆ بووە و خاوەنی دەسەڵاتی خۆی بووە تا لە سایکس–بیکۆ و لۆزان دابەش کراوە ، بە پشتگوێ خستنی سیڤەر ، مافەکانی لە مێژوودا بزر نابێ ، بەڵکو دیارە لەلای کێیە .

٢– باس لەوە دەکرێ کە کوردستان بەشێك بووە لە عێراق لەژێر ناوی برایەتی کورد و عەرەب ، ئەوەش راست نیە.

٣- گوایە لەبەرئەوەی کورد عەشایر و ناکۆك و بێ توانا بووە ، بۆیە نەبونەتە دەوڵەت ، ئەوەش راست نیە..

٤- لەلایەکی تریشەوە بەشی زۆری خەلکی کوردستان تەنانەت پسپۆرەکانیش وەك پێویست زانیاریان لە بارەی ئەو ڕێکەوتنامانە و ڕەهەند و پالنەر و دروستکەرەکانی نیە ، بۆیە هەلوێستی هەڵە و جاروایە پێچەوانەی بۆ دروست دەبێ ، چونکە سەرچاوەی زانیاری سەلامەت نیە ، هەر بەنمونە لە بەیانی فیدراڵی کوردستان ، کەلە ١٩٩٢/١٠/٤ دەرچوە پڕە لە هەڵە ، نوسیویەتی مادەی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤ )ی بەشی چوارەم ! کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیە بەشی سێیەمە ، چۆن دەکرێ بەلگەنامەیەکی وا گرنگ ئاوا هەڵەی لێ بکرێ و دوای ١٧سال نەزانراوە و چاك نەکراوەتەوە ، هەر لەو چوارچێوەیە و لەبەر نەبوونی زانیاری تەواو دەبینین گەلێ جار دۆستیان لێ بووەتە ناحەز و بە پێچەوانەش ، نوسەرێك دەنوسێ کەمال ئەتاتورك تورکیای لە تاریکیەوە وەرچەرخاندە ڕووناکی[1] ! !...

لەگەڵ زۆر چەمکی تر کە پێویستی بە راست کردنەوە هەیە.

ئەوەی ئەو وێنە هەڵەیە بە مێژوونووس و سیاسەتمەداری کورد دەدا هۆیەکانی زۆرە ، بەلام یەکێك لە هۆیە بنچینەییەکان ئەوەیە ، ئەو مێژوو و زانیاریانە لە سەرچاوە ڕەسەنەکەی خۆی وەرناگیرێ ، بەلکو دوای ئەوەی بە دەستکارییەوە وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی یان روسی یان تورکی ، ئینجا کورد لەوانی وەردەگرێتەوە ، هەریەکەش تەرازووی خۆی هەبووە ، لە روسیدا بەپێی ئایدیۆلۆژیای مارکسی دەبوایە رەهەندی ئایینی بە سەلبی بنرخێنرێ ، ئەوەش دەبوە هۆی ئەوەی بەشی هەرە گرنگی مێژووی کورد بە سەلبی وەربگێڕدرێ ئەو بۆچوونە سەقەتە دەهاتە کایەوە ، لە دەروازەی عەرەبیش وێنەیەکیان دەدایە خوێنەر کە سەروەری بە عەرەب دەدات و ناو و ئەدرەسی دەوڵەتا نی وەك عێراق و سوریا و ئەردەن زەق بکەنەوە و هێنانە کایانەیان بدەنە پاڵ بزوتنەوەی نیشتمانی و شۆڕشەکان ، نەك پلانی ئیستعمار ، ئەگەر بەوردی لە وەی خوارەوە سەرنج بدەینە وەرگێڕاوی ماددەی (١)ی سایکس- بیکۆ لە دەقە ئینگلیزیەکەی و عەرەبیەکەی چەندە جیاوازە:

[1] بڕوانە دەقی گوتارەکەی لە دوا لاپەڕەی گولان ژ:٢٦٨

١. That France and Great Britain are prepared to recognize and protect an independent Arab State or a Confederation of Arab States in the areas (A) and (B) marked on the annexed map, under the suzerainty of an Arab chief. That in area (A) France, and in area (B) Great Britain, shall have priority of right of enterprise and local loans. That in area (A) France, and in area (B) Great Britain, shall alone supply advisers or foreign functionaries at the request of the Arab State or Confederation of Arab States.

**اتفاقيه سايكس – بيكو**

**٩ أيار (مايو) ١٩١٦**

**المادة الأولى:** إن فرنسا وبريطانيا العظمى مستعدتان أن تعترفا وتحميا دولة عربية برئاسة رئيس عربي في المنطقتين "آ" (داخلية سوريا) و"ب" (داخلية العراق) المبينة في الخريطة الملحقة بهذا الاتفاق. يكون لفرنسا في منطقة (آ) ولإنكلترا في منطقة (ب) حق الأولوية في المشروعات والقروض المحلية ، وتنفرد فرنسا في منطقة (آ) وإنكلترا في منطقة (ب) بتقديم المستشارين والموظفين الأجانب بناء على طلب الحكومة العربية أو حلف الحكومات العربية.




لە ئینگلیزیەکە ناوی عێراق و سوریای تێدا نیە ، کەچی لە وەرگێڕاوە عەرەبیەکەدا بە ئەنقەست دانراوە ، کوردیش لە عەرەبیەکە وەریدەگرێت و بەو شێوەیە دەکەوێتە هەڵەیەکی ستراتیژی یاسایی و سیاسی ترسناک و بێ بەرامبەر خزمەتێکی گەورە بە پرۆژەی عروبە و رەسەنایەتی عێراق دەکا بۆ ئەوەی بنچینەیەکیشی هەبێت .

بە هەمان شێوە دەبینین لە سیڤەریش ناوی عێراقی هەر تێدانیە ، کەچی مێژوونووسە عەرەبەکان هەرچی میزۆپۆتامیایە کردویانەتە عێراق..

بۆ هەموو ئەوانە لێرەدا دەمانەوێت راستەوخۆ لە دەقە ئەسڵیەکەی وەرگرین و وەریگێڕینە سەر کوردی ، ئینجا لە روانگەی عەرەبی و تورکی و خەڵکی تر مادەکان هەڵنەسەنگێنین ، بەڵکو لە روانگەیەکی کوردستانی پەتی هەڵی سەنگێنین کە هاوتا بێت لەگەل پێوەرە ئەکادیمیەکان .

ڕێكەوتنە نێودەوڵەتیەكانی كۆن لەبەر گرنگی بە زمانی لاتینی دەنوسرا ، دوایی بەزمانی فەڕەنسی ، ئێستا بە زمانی ئینگلیزی زیاتر دەنوسرێ ، ڕێكەوتننامەی سیڤەر بە فەڕەنسی نوسراوە ، بەهۆی زمان زانانی فەڕەنسی خۆمان لە وەرگێڕانە ئینگلیزیەكەی دڵنیا بووین كە سەلامەتە، بۆیە لەسەر ئینگلیزیەكە بە دڵنیاییەوە كارمان كرد ، گومانمان لەوە بوو ئەو هەڵەیەی (كرانی عوسمانی بە توركیا) لە وە رگێڕانی فرنسیەكە بۆ ئینگلیزیەكە بێت ، دەركەوت لەوێش هەروابوە ، كەچی ڕاستیەكەی ئەو كاتە توركیا* هەرنەبوو وەك دوای ڕوونی دەكەینەوە.

ئەو كارەی ئێمە بۆ هەموو كوردێك پێویستە ، بەتایبەتی سەركردە و سیاسەتمەدارەكان و دیپلۆماسیەتی كورد ، تەنانەت بۆ دۆستەكانی كوردیش بۆ هەموو ئەوانەی كە بیانەوێت لە ناوەڕۆكی كێشەی كورد بگەن پێویستە..

لەلایەكی تریشەوە بۆ باری یاسایی وسیاسی هەرێمی كوردستان و هەر داوایەكی فراوانتر پێویست دەكا ، هەروەها برا عەرەب و تورك و فارس و باقی نەتەوە براكانیشمان تێبگەن ئێمە (كێشە) نین ، ئێمە مێوان نین ، ئێمە كێشەمان بۆ دروستكراوە ، بۆیە هەوڵدەدەین ناوی دۆزی كورد بە (المشكلە الكوردیە)ش نەیەت ، بەڵكو لەرووی یاساییەوە بە (قەزیە) بێت.

## كارەكەمان دوو بەشە:

**یەكەمیان** : وەرگێڕانی دەقی سیڤەرە كەلەلایەن لیژنەیەكی پسپۆر بە سەرۆكایەتی پرۆفیسۆر یاریدەدەر سەلام ناوخۆش بوو ، هەم شارەزا لە زمانی ئینگلیزی و هەم شارەزا لەو پەیماننامانە ئینجا سەركەوتو بو ، هەلبەتە هەر ٤٣٣ مادە تەرجەمە نەكراوە ، بەلكو هەموو ئەو مادانەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە كوردەوە هەبوە وەك دەق وەرگێڕدراو ە، باقیەكەی تر وەك ئاماژە وەرگێڕدراوە .

**دووەمیان**: هەلوەستە كردنە لەسەر ئەو ڕێكەوتننامەیە ، ئاخۆ بۆچی جێبەجێ نەبوو ؟ لایەنە ئیجابی وسەلبیەكانی چی بوو ، لایەنە بەرپرسەكان كێن؟ لە نێوان

* گەورەترین ئەنسیكلۆبیدیای عوسمانی لە كۆتایی سەدەی ١٩ دەرچوو لەلایەن شمس الدین سامی بۆ جوگرافیاو ولاتناسی ،ناوی توركیای تێدانیە كەچی ناوی كوردستانی تیایە ، ئەوەش بە ڕوونی دەری دەخا كە ئەو كاتی توركیا نەبوە تا ئەتاتورك هات توركیای دروست كرد .

فرنسا و بریتانیا و ئەمریکا و روسیا و عوسمـانی و کـەمالی و کـورد خـۆی و عـەلمانی و ئیسلامی کامیان باش بوون و کامیـشیان دژ بـە سـیڤەر ؟ ئایا دەبێتـە بنـچینەیەك بـۆ بارودۆخی هەرێمی ئیستا و سەرجەم کوردستا ن بۆ هەر هەنگاوێکی چارەنوسـی ؟ ئایـا لەرووی یاساییەوە هەلوەشاوەتەوە ؟ زۆر ووردەکاری تـریش لێـی دەکـەین بەتایبـەتی بـەدوای ئـەوەین ئـا خۆ دەتـوانین ناسـنامەیەکی یـەکگرتو بدۆزینـەوە بـۆ ئەوانـەی لەمەینـەتی کـورد بەرپرسـیارن و ئەوانـەی دژی سـیڤەر بـوون و هـەر هـەمانیش لـە کوشتاری ئەرمەنی وکورد بەرپرسیارن .

# بارودۆخی بەستنی کۆنگرەی سیڤەر

لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم کۆنگرەی سیڤەر لە ١٩٢٠/٨/١٠ بەسترا ، بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکی سیاسی و یاسایی سیڤەر بگەین پێویستە هەڵوەستەیەك لەسەر ئەو جەنگە و سەرەنجامەکەی بکەینەوە:

ئەوروپا کیشوەرێکە لەکۆنەوە بە شەڕانی بەناوبانگ بوو ، لەمێژووی نوێشی شەڕی ٥٠٠ ساڵە، شەڕی سەد ساڵەی فەڕەنسی و بەریتانی و شەڕی سیی ساڵەی کە لەدواییدا بە ڕێکەوتننامەی ویستڤالیای ١٦٤٨ کۆتایی هات ، بەو شێوەیە خاوەنی جەنگ و گەلەکۆمەکی بووە، یان لەناووخۆ یا لەگەڵ کیشوەرەکانی تر ، تا شۆڕشی پیشەسازی و سەردەمی کۆلۆنیالی (مستعمرات) هات ، جیهان و ئەوروپا کەوتنە قۆناغیکی نوێ بەتایبەتی لەسەرەتای سەدەی ٢٠ ، بەو شێوەیە بارودۆخەکە خەملیوە:

١- کێبرکێ ی توند لەنێوان چەند وڵاتێکی تەکنۆلۆجیدار دروست بوو.

٢- هەندێ وڵات موستەعمەرەیان کەم بوو لەچاو ئاستی تەکنۆلۆجیەکەیان و پێویستیان بە فراوانکردنی سنوری بازاڕ و لەپیش هەموویان ئەڵمانیا.

٣- ململانێی نەتەوایەتی و کێشەی سنوری هاتە پاڵ کێشە درێژخایەنەکان.

٤- وەرچەرخانی دەرەبەگی بۆ بۆرجوازی ، ئیمپراتۆریەکان بۆ دەوڵەتی هاوچەرخ و دۆزینەوەی سامانی ژێرزەوی...

هەموو ئەوانە کێبرکێیان زۆر توندکرد ، خودی ئەڵمانیاش لە ڕێکەوتننامەی ویستڤالیای ساڵی ١٦٤٨ خۆی پێ مەغدور بوو لەگەڵ دەوروبەر و داوای زۆر هەرێمی دەکردەوە، لەوانە: ئەلزاس ، لۆرین ، یۆین...

واتە باری ئەوروپا بۆ جەنگێکی سەرتاسەری لەتێز بوو ، هەر بەتیرۆرکردنی (ئەرشیدۆك فردیناند)ی جێنشینی شای نەمسا و هاوسەرەکەی لە ١٩١٤/٦/٢٨ لەلایەن (پرانسیب- قوتابییەکی سربی سەر بە ڕێکخراوی لەپ ڕەشەکان بوو) یەکسەر جەنگ هەڵگیرساو جیهان دابەش بوو بۆ دووبەرەی دژ بەیەك بەو شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەو وڵاتانەی لەگەڵ ئەڵمانیا کەوتن بریتیی بوون لەمەجەر و نەمسا، بولگاریا، دوایش عوسمانی ، ناویان لێنرا وڵاتانی محوەر .

٢- ئەو دەوڵەتانەی لەگەڵ بەریتانیا و فەڕەنسا بوون بریتی بوون لە ئیتالیا، بلجیکیا، ئەمریکا ، ڕوسیا ناویان لێنرا هاوپەیمانان.

لێرەدا پێویست بەوە دەکا هەڵوەستەیەك لەسەر دەوڵەتی عوسمانی بکەین بزانین بۆچی چووەتە ناو ئەو جەنگە ، کە بووە هۆی ئەوەی سیڤەری بەسەردا بسەپێنرێ؟

دەوڵەتی عوسمانی ببووە خاوەنی ٣٢ ویلایەت لە ئەورووپاوە تا ئەفریقا و ئەنادۆل و جزیرەی عەرەب و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەدەستەوە بوو ، ئەوکاتە زۆربەی ویلایەتەکانی ئەوروپی لێسەندرابۆوە، لەنێو دەوڵەتدا بزوتنەوەیەکی عەلمانی تۆرانی بەناوی (ئیتحادوترقی) زاڵ بوبوو بەسەر دەسەڵات بەتایبەتی لەدوای ساڵانی ١٩٠٨ و ١٩٠٩ توانیبوویان سوڵتان عبدالحمید لابدەن و خۆیان (ئەنوەرپاشا، تەڵعەت پاشا، جەمال پاشا) دەسەڵات بگرنە دەست و سوڵتان محەمەد رەشاد وەك سیستەمی مەلەکی دەستوری بهێڵنەوە، لەکۆمەڵێك قەیرانی ئیداری و ئابووری و سیاسی و زانستی و نەتەوەیی ئاڵابوون ، بۆیە قەیسەر نیکولای رووسی ناوی لێنابون دەوڵەتە نەخۆشەکە، لە رەوتی مێژووش بەجێ مابوون ، بۆیە دەیانزانی بەشێکی ئەو جەنگە لەسەر میراتی ئەوانە و واشیان زانی ئەڵمانیا سەرکەوتووە بۆیە بە بڕیاری ئەنوەرپاشا لە ١٠/٢٩/ ١٩١٤ چوونە پاڵ ئەڵمانیا.

دوای دوو ساڵ جەنگ بەرەبەرە وڵاتانی تەوەر بەرەو شکست چوون و تەن بەتەن جەنگیان لەگەڵ دەوەستێنرا خۆیان بەدەستەوە دەدا ، تا لەسەعات (١١)ی ڕۆژی ١١/١١/ ١٩١٨ لەسەرتاسەری بەرەکان جەنگ وەستێنرا ، ئیتر نۆرەی ئەوە هات چۆن جیهان دابەش بکەنەوە و سیستەمێکی نوێی جیهانی دابهێنن ، بڕیاردرا وڵاتان لەسەر بنچینەی نەتەوەیی دروست بکرێ و جاڕی مافی چارەنووس دراو دەزگای وەك (عصبە الامم- کۆمەڵەی نەتەوەکان) دروست بوو ، بۆ هەریەکە لە وڵاتانی دۆڕاویش کۆنگرەی تایبەتی سازکرا ، بەو شێوەیەی خوارەوە:

کۆنگرەی( فرسای) بۆ ئەڵمانیا لە ١٩١٩/٧/٢٨.

کۆنگرەی (سان جرمان) لە ٩/٣٠/ ١٩١٩بۆ نمسا.

کۆنگرەی (نوی ) لە١٩١٩/١١/٢٧بۆ بولگاریا و مەجەر.

كۆنگرەی(رابۆلۆین)لە١٩٢٠/١١/١٢بۆئیتالیا و یۆگوسلاڤیا.
كۆنگرەی(ریگ )لە ١٩٢١/٣/١٨بۆ روسیا وپۆلۆنیا..
كۆنگەری سیڤەر تایبەتە بەعوسمانی كە لە ١٠ /٨/ ١٩٢٠بەستراو پێك هاتبوو لە ٤٣٣ مادە ئەوە بە كورتی پێشینەی سیاسی و یاسایی سیڤەرە كە تیایدا (٣) مادەی گرنگ سەبارەت بە كوردستان تۆمار كرا.

# باری سیاسی كورد لە پێش و لە دوای سیڤەر

وەسفی سیڤەر بە چاك و خراپ نسبیە ، هەر خودی ئەو ڕێكەوتنە سەلبی و ئیجابی تێدایە ، دیوێكی تری سیڤەر هەیە كەمتر باسكراوە ، ئەویش ئەوەیە مێژووی میللەتی كورد لە پێش و دووای سیڤەر لێك جیایە ، جاران خاوەنی دەسەلات و میرنشین و دەولەت بووە ، لە دوای ئیسلام (مەردۆخی دەلێ) ٦٤ دەولەت و میرنشینی كوردی هەبووە ، كوردستان داگیركراو نەبووە ، وەك بەشێك لە مێژوونوسی و سیاسەتمەداری هاوچەرخ وەسفی دەكەن ، ئەویش وەك میللەتانی دەوروبەر خاوەن ئیمبراتۆریەت بووە ، رۆلی خۆی لە ئیمبراتۆرییەكانی ئیسلامی بەزیادەوە هەبووە، هەروەك چۆن عەرەب و فارس و تورك بەشیان بووە ، كوردیش ماوەی سەدەیەك سەركردایەتی جیهانی ئیسلامی كردوە لە دەولەتی ئەیوبی ، ئەوە بۆ میللەتە بچوكەكانی هاوتای كوردی وەك چەركەس و ئەرنائوت و ئەلبان و بۆسنی و بەربەر و ئەفغانی و... نەگونجاوە ، بۆ كورد گونجاوە و خالی بەهێزی مێژووییە ، لە دەوروبەری خۆشی وەك ئەو میللەتانە جاری وابووە داگیركراوە و جاریش بوە داگیركەربووە ، چەند جار حوكمی بەغدای كردوە، لەماوەی ئەو ١٣سەدەیەدا سەرجەم (٥٠) سال لەژێر داگیركاری نەبوە ، لە سەردەمی عوسمانی باری سیاسی كورد لە عەرەبیش باشتر بووە ، كورد بەپێی رێكەوتنامەیەك (سولتانی- بەدلیسی) لەسالی ١٥١٤وە لەگەل عوسمانی بووە ، سوپای عوسمانی نەهاتە كوردستان تا ئەتاتورك هات ، وەك د.نوری دەرسیمی لە كتێبی (دەرسیم لەمێژووی كوردستان...) لە ل١٥دەلێ لە ١٩٣٦بۆ یەكەم

جار لە مێـژوودا دەرسیم داگیرکرا ، دەسەلأتی کوردی لاواز نەبوە، هەر بەکورتی بەراوردێك دەکەین لەنێوان دەسەلأتی کوردی لە پێش و دووای سیڤەر ، بۆ ئەوەی بزانرێ مانای سیاسی و یاسایی رێکەوتننامەی سیڤەر چ دەبەخشێ بۆ ئەو دوو ماوە مێژووییە، یاخود بە فراوانتر پرسیارەکە ئاراستە بکەین ئاخۆ با بزانین باری سیاسی کورد لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی و سەردەمی عەلمانی چۆن بوو ، ئەو دووڕیانەش لە کۆتایی سەدەی ١٩ دەست پێدەکا تا سەرەتای سەدەی ٢٠ و هەرە گرنگی روداوەکانی ، ئینقلابی ١٩٠٨ ی ئیتحادی و جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤– ١٩١٨ و رێکەوتننامەی سایکس– بیکۆی ١٩١٦ و سیڤەری ١٩٢٠ و لۆزانی ١٩٢٣یە ، شانۆیەکە دادەخرێ بە دروستبونی دەوڵەتەکانی تورکیا و سوریا و عێراق و زینـدانی کردنی کورد لە بەندیخانەی ئەوانە.

سروشتی ئەو دووماوەیە: لە پێش سەدەی بیست سروشتی جیهان بەگشتی و جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی سەردەمی ئیمپراتۆریات و دەسەلأتی ئاینی و دەرەبەگی و سەرۆك عەشیرەتی و میراتی سیاسی و کۆمەلأیەتی و زاڵی فەرهەنگی گوند بەسەر شار بوو ، سەردەمی پاش سەدەی بیست سەردەمی دەوڵەتی هاوچەرخ و فیکری نەتەوەیی و عەلمانی و دەسەلأتی دەستوری و پیرۆزی سنوری دەوڵەتان و بۆرجوازییەت و بەرقەراری یاسای نێودەوڵەتی و سەرهەڵدانی (کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ٦/٢٥/ ١٩١٩) و (نەتەوە یەکگرتوەکان لە ١٩٤٦) و سەردەمی زاڵبوونی فەرهەنگی شار بەسەر لادێ ، بۆ کور د واهات لە سەردەمی دووەمدا زیانی گەورەی لێ کەوت و لە کاروان دابڕا و مەینەتی بۆ دروستبوو ، بەپێی ئەو بەراوردەی خوارەوە بۆ باری سیاسی کورد لە هەردوو ماوەی پێش سەدەی بیست و پاش سەدەی بیست بەم شێوەیەی خوارەوە:

خشتەی بەراورد بۆ كێشەی كورد، هەڵوێستی خەلافەت[*] و عەلمانی تۆرانی

| دەسەڵاتی ئەنقەرەی عەلمانی (ئەتاتورك) (لەكۆتایی سەدەی ١٩ تا ٢٠٠٥ز | دەسەلأتی خەلافەت لەئەستەمبۆل (سەدەی ١٣ تا ١٩٠٨) |
|---|---|
| ١– بیرێكی عەلمانی نەتەوەگەری تۆرانی.<br>٢– بنەماكانیان دژ بە ئیسلام و كورد بوو<br>٣– رێككەوتنی سیڤەر و مادەكانی ٦٢ و٦٣ و٦٤ بە مەرگی توركیای نوێ داناوە<br>٤– هیچ رێكەوتنێكی مۆركراوی لەگەڵ كورد نەبوو، هەر بەڵێنی زارەكی بوو.<br>٥– بواری هیچ چالاكیەكی سیاسی و ڕەوشەنبیری كوردی نەدەدا.<br>٦– لۆزانی هێنایەدی.<br>٧– دوایی كوردی قڕكرد.<br>٨– سەرەنجام ئەنقەرە سەركەوت و میللەتی كورد كەوتە ئەو مەینەتیە تا ئێستا. | ١– بیرێكی ئیسلامی عوسمانی بەلاوازی.<br>٢– دژایەتی كوردی تیا نەبوو.<br>٣– دوایش سیڤەری مۆركرد لە ساڵی ١٩٢٠<br>٤– رێكەوتنی دووبەدوو و نێودەوڵەتیشی مۆركردبوو بۆ سەربەخۆیی كوردستان<br>٥– چالاكی سیاسی و ڕەوشەنبیری حزبی هەموو لە ئەستامبۆل بوو<br>٦– بەشداری لۆزان نەبوو تەنها لەسیفەر بەشداری كرد<br>٧– لەگەڵ كەوتنی ئەستەمبۆڵ هەموو حزب و ڕۆژنامە و ناوەندە كوردیەكانی لێ داخرا<br>٨– هەتا خەلافەت مابوو كورد سەربەخۆ بوو ، ئەگەر خەلافەت سەركەوتایە ئێستا كوردستان لەرێزی میللەتان بوو.<br>٩– نەك ویلایەت هەتا ئیالەتیش بە ناوی كوردستان بووە[٢] . |

[*] هەرچەندە سولتانەكانی عوسمانی گەلێ جار زالم بووینە بەرامبەر خەلكی بەلأم لە كۆتاییدا دەسەلأتەكەیان بە خەلافەت حیسابە بە پێی پێوەری ئەكادیمی ،ئیمەش ئاوا ناوی دەبەین .

[٢] بڕوانە نەخشەی عوسمانی سالی ١٨٩٣- ویلایەتەكانی بەشی ئاسیا ،هەروەها نەخشەی ئیداری سالی ١٨٩٦ .

| | |
|---|---|
| ٩- ناووزمـــانی کـــوردو کوردســـتان قەدەغە کرا<br>١٠- ســەردەمی عــەلمانی نــەك هــەر کیـانی سیاسـی، بەلکوبـە هـاوولاّتی پلە ٢و٣ .<br>١١- ســنوری ئیــستای کوردســـتان نیوە بووە . | ١٠- تاخەلافــەت مــابوو ســـەرجەم کـــورد خـاوەنی ٦٤ دەولـەت ومیرنـشین وقـەوارەی سیاسی بوو.<br>١١- سنوری کوردستان وەك خـۆی گـەورە بوو |

# ئەحکام و سروشتی ماددەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)

کوردستان یەکەم ناونیشان ( ئەدرێس ) بوو لە زنجیرەی دەوڵەتانی پێشنیارکراو ، گرنگییەکی زۆری پێدرا بوو ، بەلاّم دەبینین هەندێك تایبەتمەندی سیاسی و یاسـایی لێ وەر دەگیرێ ، لە هەموویان زەقتر هەڵپەساردنی بڕیاری چارەنوسی کوردستان بوو بـۆ ماوەی ساڵێك (ماددەی ٦٤)، کوردستان و ناوچەکانی (سمیرنا- ئەزمیری ئێستا) بـەو شێوە هەڵپەساردنە مانەوە ، رەنگە لە ئەنجامی زیندوکردنەوەی ئەو مـاددە یاسـاییانە پاساوی سمیرنا و کوردستان پێك ببەستن و بڵێن سروشتی یاسایی هەردوولا وەك یـەك بوو بۆیە سەرەنجامەکەشیان وەك یەك بوو بە تورکیاوە لکانەوە ، هەڵبەتە ئەوە وانیـە ، ماددەکانی سەبارەت بە سەمیرنا لە (٦٦-٨٣) یە، بەلاّم بۆ سەربەخۆی نـەبوو بـەڵکو بۆ ساغکردنەوەی سنوری یۆنـان و تورکیـا بـوو ، ئـاخۆ ئـەو ناوچـەیە بـەپێی راپرسـی دەکەوێتە سەر کام لا ، دوایی لە ئەنجامی سەرکەوتنەکانی ئەتاتورك لە ١٩٢٢ کەوتەوە سـەر تورکیـا ، هە رچـی کوردسـتانە ماددەکـانی بـۆ سـەربەخۆیی بـووە ، لێـرەدا پرسیارێکی مێژوویی و یاسایی قوت دەبێتەوە ، ئـەویش ئەوەیـە: مـادام کوردسـتان وا گرنگ بووە و لە سیڤەریش لـەریزی پێـشەوەی زنجـیرەی ولاّتـانی تـریش بـووە بۆچـی یەکسەر وەك عێـراق و سـوریا و...هتـد ، لـە عوسمـانی جیانەکرایـەوە؟ هەڵبەتـە بـۆ وەلاّمی ئەو پرسیارە شروڤەیەکی زۆر لابەلا پێشکەش کراوە ، لەوانە: گوایە کوردستان

ئامادە نەبووە بۆ دەوڵەت ، عەشایری و داخراو و ناكۆك بونە، هۆشیاری و خواستی دەوڵەتبونیان نەبوە ، هاریكارییان لەگەڵ بەریتانیا و فەڕەنسا نەبووە...هتد

لە بۆنەیەكی تر لەو نزیكانە بە درێژی و بە بەڵگەنامە وەڵامی ئەو شروڤانە دەدەینەوە كە دروست نین ، چونكە هەرچۆنێك بێت ئاستی سیاسی و كۆمەڵایەتی و یاسایی و ئابوری و فەرهەنگی كوردستان لەعێراق و ئەردەن چاكتر بوو ، ئینجا وشەی كوردستانی رەهەندی یاسایی و ئیداری و سیاسی خۆی هەیە ، ناسنامەی پەیوەندی یاسایی و سیاسی (گەل و هەرێم و دەسەڵاتی سیاسی) هەڵگرتووە كە هەرسێكیان كۆڵەكەی دەوڵەتن بەپێی یاسای نێودەوڵەتی[3].

ئەو ناوەش بەلای كەمی لەسەدەی (١٢) وە هاتوەتە نێو فەرهەنگی سیاسی و ئەنسكلۆپیدیای وڵات و دۆسیەی ئیداری ، واتە كوردستان مۆڵكی كوردان بووە ، لەكاتێكدا ئەو ناسنامە سیاسی و یاساییە لەنێو عەرەب نادۆزیەوە تەنها لە جزیرە نەبێت كە بە عربستان ناو دەبرا ، ئەگینا ناوی سوریا و لوبنان و ئەردەن و فەلەستین و عێراق هەر عەرەبیش نیە[4] ، ئەنادۆلیش كە ئێستا بوەتە توركیا ناوێكی توركی نیە ، یۆنانیە (لە بنەچەدا ئەناتۆڵە) بە مانای رۆژهەڵات دێت ، ناوی توركیا لەگەڵ دروستبونی لە (١٩٢٢–١٩٢٣) سەری هەڵدا ، زۆربەی ئەو وڵاتانەی ناوەكانیان گوزارش لە میللەت نەكا بە دەسكرد ناودەبرێ ، كەواتە كوردستان رەسەنە وەك ئەنادۆل و عێراق و سوریا نییە..

رەنگە تاكە شرۆڤەیەكی لۆجیكی بۆ ئەوەی بزانین بۆچی كوردستان یەكسەر جیانەكراوە لە عوسمانی ئەوەیە هێزەكانی هاوپەیمانان نەگەیشتنە كوردستان ، لەكۆتایی جەنگ هێزەكانی بەریتانی بە ئاراستەی كوردستان گەیشتنە خواروی (حەمرین) ، بە ئاراستەی موسلیش لە ١٠/٢٨/ ١٩١٨گەیشتنە شەرگات ، لەلای شامیش فەڕەنسا گەیشتە سوریا و لبنان ، لەلای سەروش بە هاوبەشی هێزەكانی یۆنان و ئیتالیا گەیشتنە ئەستەمبۆل و ئەنادۆل ، لەلای روسیاش گەیشتنە ئەرمینیا دوایی لەگەڵ شۆڕشی ئۆكتۆبەری ١٩١٧ هێزەكانی روسی لە جەنگ كشایەوە ، بەڵام

---

[3] بڕوانە: قانون الدولی العام- لەراستیدا لەساڵی ١٩٢٩ بەفەرمی دان بەوە هێنرا كە مەرجەكانی بوون بە دەوڵەت بەپێی یاسای نێودەوڵەتی بریتییە لە هەبوونی هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی.

[4] بڕوانە: معجم البلدان –یاقوت حموی ، هەروەها قصة الحضارة ، هەروەها مەوسوعەی جودی ...

هێزی عوسمانیش لە كوردستان نەمابوو ، حكومەتێكی كوردی لە سلێمانی (وەك پایتەخت) سەری هەڵدا بەڕابەرایەتی شێخ مەحمود و عوسمانیش دانی پیاهێنا (بەپێی بروسكەی عەلی ئیحسان پاشا لە ١٩١٨/١٠/٣٠)، دوایی لە (١٩١٩ و ١٩٢٢) بەریتانیاش وەك (حوكمدار) دانی پێدا هێنا ، بەرە بەرە هێزەكانی بەریتانیا گەیشتە هەندێ ناوچەی خواروی كوردستان ، واتە ئاستی سیاسی كوردستان لەسەروی ئینتداب بوو ، ئەوە لەلایەك لەلایەكی تریش وەك لە وەسفەكانی بەریتانی و فەرەنسی هاتبوو كوردستانیان بە (پەنجام) دەچواند و نەدەوێران هێزەكانیان بنێرنە نێو قوڵایی شاخ و داخەكان ، لەسەر هیچ لایەك ساغ نەدەبۆوە ، بۆیە بە هەڵپەسێردراوی مایەوە بۆ ماوەی ساڵێك ، ئەتاتوركیش پشتی بەو بەڵگە بەست و دانی بە وڵاتانی عەرەبی هێنا بەهۆی ئەوەی لەژێر دەستی هاوپەیمانان بوو[٥].

دەسەڵاتی سیاسی ئەرمەن و كورد گەشە سەندووتر بوو ، ئەوەش بەسەلبی بۆیان گەڕایەوە لە كاتێكا عەرەب دەسەڵاتی لاواز بوو بە تەواوی كەوتە ژێر دەست و بە ئیجابی بۆی گەڕایەوە ، لەكۆتاییشدا ئەرمەن و كورد لەژێر ئینتدابی هیچ لایەك نەبوون بێ خاوەن مانەوە ، لەنێوان هێزە كاریگەریەكانی ئەو ناوچەیە (بەریتانیا ، ئێران ، شێخ مەحمود ، سمكۆ ، ئەتانورك ،..) كەوتە دەست ئەتاتورك وایان بەسەر هات وەك لە دوایی باسی دەكەین ، (ئەرنۆڵد تۆینبی) یش هەر ئەو رایەی هەیە و هەولەكانی ئەتاتورك بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە.

---

[٥] ئەو دان پیاهێنانە لە ماددەی (١)ی میساقی نیشتمانی توركیش واهاتبوو.

# سنوری كوردستان لە ماددەی ( ٦٢ )

بەشێكی زۆر وەك بەیانەكەی فیدراڵی كوردستان[٦] ئاسا پێیان وایە كە سیڤەر هەموو بەشەكانی كوردستانی یەكخستەوە ، كەچی بەشێكی تر پێیان وایە ئەو سنورەی لە سیڤەر دیاریكرا تەنها سەرووی كوردستان دەگرێتەوە ، نەك خوارووی ،، واتە بەزمانی ئێستا بڵێین تەنها بەشێك لە كوردستانی توركیای دەگرتەوە نەك عێراق (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤١)ی كتێبی ( القضیة الكوردیة في المؤتمرات الدولیة ص٥٩–٦٤)، یان وەك (ڤان بنسن) دەڵی ژورێكیان دا بە كورد بۆ دروستكردنی دەوڵەت .

لەراستیدا لە هەردوولا زیادەڕەوی تێدایە ، ڕاستە كوردستانی ئێرانی نەدەگرتەوە وەك باسمان كرد ، چونكە ئەو كۆنگرەیە تایبەت بوو بە میراتی عوسمانی ، بەلاَم كوردستانی خوارووی دەگرتەوە ، هەروەك لە ماددەی (٦٤) زۆر بەروونی ئاماژە بە ویلایەتی موسڵ دەدا و دەڵی هێزەكانی هاوپەیمانان رێگری ناكا لە تێكەڵ بوونی كوردستانی بەشی ویلایەتی موسڵ بۆ ئەو دەوڵەتەی كوردستان ، لە كۆنگرەی سان ریمۆش داكۆكی لەسەر كرا ، ئەوەی جێی هەڵوەستەیە ئەو دەستنیشان كردنەی لە ماددەی (٦٤) وە كە دەڵی (گەلی كورد كە لەو سنورەی لە ماددەی ٦٢ دیاریكرا) وا هەست دەكرێ جەخت كردن بێت لە سنورێكی دیاریكراو بەپێی پێناسێكی جوگرافی نوێ جیا لە چەمكی كوردستانی سروشتی كە لەسەردەمی عوسمانی (وەك لە هەردوو نەخشەی ئیداری ساڵی ١٨٩٣، ١٨٩٦)، وە هەروەها لە ئەنسیكلۆبیدیای عوسمانی[٧] كوردستان دیاریكراوە كوردستانێكی پان و بەرینە ، بەلاَم دوای وردبونەوە دەردەكەوێ ئەو جەختە بۆ بەری لای ئەرمینیایە نەك خواروو ، بەو بەڵگەیەی لە بروسكەكانی چەرچڵ بۆ سەركردە سەربازیەكان و بۆ خودی شا فەیسەلیش خوارووی چیای حەمرینیش بە كوردستان ناودەبات[٨] ، ئینجا لە كۆنگەری قاهیرەی ١٢–

---

[٦] بڕوانە دەقی بەیانەكە كە لە ١٩٩٢/١٠/٤هاتوەو دەلێ:هەمو كوردستانی دەگرتەوە

[٧] **بڕوانە :مادەی كوردستان لە قاموس الاعلامی شمس الدین سامی ،هەروەها لە (مادەی ویلایەتی موسڵ) دەڵێ :خەلكەكەی زۆری عەرەبن بەلام هەرێمەكە چارچەیەكە لەكوردستان .بۆ ئەو مەبەستە بشڕوانە :ل٣٠٧ی ( كوردو كوردستان لە یەكەم ئەنسیكلۆبیدیای عوسمانی،**

[٨] دەقی بروسكەكە دەڵێ: ئێمە بەلێنی پێك هێنانی دەولەتۆكەكی عەرەبیمان پێدایت نەك ئیمپراتۆریەت بۆیە

١٩٢١/٣/٢٤ کە عێراقی پێ دروستکرا هەر پاڵپشت بەو سنورەی ماددەی (٦٢)ی سیڤەر دەکا ، چەرچڵ خوارووی کوردستانی هێشتەوە بە هەڵپەسێردراوی و یەکسەر نەیخستە سەر عێراق وەك (برسی کۆکس و مس بیل و ویلسۆن) دەیانویست .

بەشێکی تر گومان لە بنەچەی یاسایی سیڤەر دەکەن سەبارەت بەو مادانەی کوردستان ، بەو بەڵگەیەی لە ماددەی ٦٢ باس لە ئۆتۆنۆمی دەڤەری دەکا ، لەکاتێکدا بۆ وڵاتانی تری وەك سوریا و عێراق و.. باس لە جیابونەوە دەکا لە عوسمانی..

بۆ وەڵامی ئەوە پێویستە دوو تەوەری گرنگ هەیە رونی بکەینەوە، ئینجا ئاسان دەبێت بۆ هەرکەسێك حوکمی لەسەر بدات.

١- ئەو وڵاتانەی بڕیاری جیاکردنەوەیان درا لە ماددەی ٩٤ یەکسەر بە دەوڵەت بوون نەبوو ، نە ئۆتۆنۆمیش بوو ، لەوانە کەمتر بوو ، بەڵکو کەوتنە ژێر سیستەمی ئینتداب[*] ، دابەشی ئیستعماری بوو لەنێو خۆیان ، کە لە پەرەگرافی (٤) ودیباجەی ماددەی (٢٢)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان وەسفیان دەکات و دەڵێت : میللەتی شارستانی میللەتانی دواکەوتە فێری ئۆتۆنۆمی بکا تادەگاتە ئاستی دەولەت ، بە هەمان شێوەش چەکی ئینتدابەکان بە ناوی ئۆتۆنۆمی هاتبوون ڕاستەوخۆ وەك مادەی (٣) ئینتدابی بەریتانی بەسەر فلستین[٩] یان ناڕاستەوخۆ لەوانی تر ، بەڵام ئەو وڵاتانە ئەوانەن کە لەژێر دەستی وڵاتێکی هاوپەیمانی دیاریکراو بوون ، کوردستان بەتەواوی لەژێر دەستی هیچیان نەبوو وەك لەوەو پێش باسمانکرد ، بۆیە ئەو شێوازە نەدەگونجا ، هەربۆیە یەکسەر ناوی ئۆتۆنۆمی دەڤەری لێنرا کە لە ئینتداب بەرزتر بوو.

٢- ئەوەی لەو مادەیە بەگومانە زیاتر ئەوانەی کە خوێندنەوە بۆ ئۆتۆنۆمی بەپێی ئەزمونەکانی ئێستا دەکەن ، کەچی ئۆتۆنۆمی لە فەرهەنگی یاسایی و سیاسی ئەو

---

سنوری تۆ(جبل حمرین)ە لەوی بەسەرەوە کوردستانە.لە بەڵگەنامەیەکی تری بەریتانیا ( fo ٣٧١/١٦٣٦٧)تیلگرام ژ:٦١٦ هەمان ڕاستی دوبارە دەکاتەوە .

[*] لە ڕاستیدا سیستەمی ئینتداب جیا بوو لە بنەماکانی مافی چارەنوس کە لە جامعەی ئیسلامی و دوای لە ١٤ بنامایەکەی ویلسون ولە جاڕنامە هاوبەشەکەی فرنسی وبریتانی هاتبوو ،بەلکو ئینتداب جۆرێکی تر بوو لە دابەشی ئیستعماری ، ئەوەش هۆیەکی تر بوو کە کۆنگریسی ئەمریکی قایل نەبوو ئەرمینیا وەرگرێ وەك ئینتداب .

[٩] بڕوانە دەقی چەکی ئینتدابی فەلەستین کە لە٢٤/یۆلیۆ/١٩٢٢دەرچوو، ٢٨ مادە بوو .

سەردەمە مانای (ماوەی گواستنەوە بۆ سەربەخۆیی)[10] داوە، هەروەك لە خالی (١٢)ی بنەماکانی ویلسۆن (ئۆتۆنۆمی) لە جیاتی مافی چارەنوس بەکارهێناوە ، وە بەپێی مادەی (١١٣)ی سیڤەر سودان سەربەخۆیی وەرگرت لە ١٩٥٢/٢/٢٢ لە سەر بنچینەی ئەو ئۆتۆنۆمیە ، لەفەرهەنگی کۆنگرەی سان ریمۆش دەولەتی سەربەخۆو ئۆتۆنۆمی یەکسان کردووە ، هەرچی ئۆتۆنۆمی ئێستایە بچوکترە لە فیدرالّی و مانای مانەوە لەژێر سیستەمی ئەو دەولّەتە لە چوارچێوەی (لامرکزی) ، لە سیڤەریش ئەو ئۆتۆنۆمیە بۆ ماوەی سالّێك بووە کە پێی وتراوە ئۆتۆنۆمی دەڤەری بەرەو ئۆتۆنۆمی نێودەولّەتی (سەربەخۆیی تەواو) ، ئەو ولاّتانەی (عێراق و سوریا و..) ئینتدابیش دوای چەند هەنگاو هەر بەو شێوەیە بووە ، بۆیە دەبینین چەرچل ڕێنمایی تایبەت بە (کۆکس) دەدات و دەلّێ :(پێویستە کۆکس ڕۆلی دوو دەورە ببینی لەکوردستان بەجیا و لە عێراقیش بە جیا مادام نێرراوی ئێمەیە لە میزۆپۆتامیا )[11]، هەرچەندە پرسی کۆکس دژی کوردستان بوو بەلاّم هەر بە هۆی تەوژمی سیڤەر لە بروسکەی ١٩٢١/٦/٢ کوردستان وعیراق بە دوو ولاّتی جیا ناو دەبا[12]، هەروەها لەدۆسیەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکیش لە بارەی سنوری تورکی – سوری بە ژ:١٦٣ی دەرچووی /١٩٧٨/٣واهاتوە:(.. وقد تم فی سیفر الإقرار بأنشاء دولة كردية ذات حكم الذاتی ..) ، واتە لە ڕوانگەی ئەمریکیش ئەو کاتی (حكم الذاتی) مانای بەرەو دەولەتی بەخشیوە و کورد بۆ دەولەت ئامادە بوە لە سیڤەر .

ئەگەر بەوردتریش بچینە نێو بابەتەکە دەبینین ئەو ناوەرۆکە یاسایی و سیاسیەی لە سیڤەر هاتووە هەمان نەخشە و پلانی سەرکردە کوردەکانی ئەوسایە ، بەتایبەتی شێخ عبدالقادری شەمزینی و مالّی بەدرخانیەکان (ئەمین عالی بەدرخان)[13] کە بەداخەوە بەشێك بەشێوەیەکی تری لێ تێگەیشتوون ، لەوانە مێژوونوسی کورد

---

[10] بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە مەوسوعە و فەرهەنگی ئەو سەردەمە تا شەستەکانیش هەروابوو، بڕوانە (القاموس السیاسی) سالّی ١٩٦٨، د.احمدعطية اللة ص٤٧٢-٤٧٣

[11] بڕوانە: د سعد بشیر اسکندر – سیاسة بریطانیا العظمی تجاه مستقبل کردستان ص٢٩٥- middieast

[12] بڕوانە : کوردستان من بدایه الحرب العالمیه الاولی الی نهایه مشکله الموصل ص٢٣٠ .

[13] بڕوانە: (فایلی دوارۆژی کوردستان-بەریتانی) لە ل٨٢، (کوردوکوردستان لە بەلّگەنامەی بەریتانی- کەمال مەزهەر)

د.کەمال مەزهەر[١٤] ، هەروەها بڕوانە نارازیەکانی تر لە (ل٧٦ی کتێبی مالمیسانژ :القومیة الکوردیة ود. عبداللة جودت)، هەروەها کریس کۆچیراش وای بۆچوە ...بەڵام هەر هەمان کتێبی (د.کەمال) دەقی گفتوگۆیەکەی (شێخ عبدالقادر) لەگەڵ ڕۆژنامەی (ئیقدام) تۆمارکردووە بەجوانی ئەوە رون کراوەتەوە کە شێخ عبدالقادر و ئاینیەکان چیان دەوێ ، پێیان وابوو لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمی وەرگیرێ بۆ ماوەیەك وەری دەچەرخێننە سەربەخۆیی تەواوی کوردستان[١٥]، بۆ زیاتریش بڕوانە دەقی نامەکەی شێخ عبدالقادر بۆ فەڕەنسا کە لە ١٩٢٠/٦/٢٥ نوسیتی[١٦]، ئەو پرۆژەیە لەلایەن فرید پاشای سەرۆك وەزیرانی دەولەتی عوسمانی (ئەستەمبۆل–سولتان واحدالدین) بە فەرمی مۆر کراوە[١٧]، دیڤید ماکدۆناڵدیش هەر وای بۆچوە لە کتێبەکەی خۆی و ئۆتۆنۆمی سەرەتای سەربەخۆیی بوە چ لە ڕێی ئینتداب چ لە ڕێی ئۆتۆنۆمی ، لە میساقی (کۆمەلەی نەتەوەکان– عصبە الامم)لە مادەی (٢٢)ش هەر واهاتبوو کە سیستەمی ئینتداب (گروپیA)* دەبێ لەدوای ئینتداب ئۆتۆنۆمی محەلی وەرگرن بۆئەوەی لە داهاتوەکی نزیك سەربەخۆ بـبن ، هەروەهاش بۆ وەرگرتن و بوون بە ئەندام لە (عصبە) سێ پۆلی وەردەگرت موستەعمەرە و دۆمینیۆ و ئەوانەی ئۆتۆنۆمیدارن[١٨]، ئەوەش دەقا و دەق خوردکراوەتەوە لە سیڤەر ، لێرەوە چاکتر بۆمان دەردەکەوێ کە ئیجابیەکانی سیڤەر بۆ کورد لەوە دێت کە وەفدی عوسمانی بەشدار بووە نەك وەفدی تورکیا ، وەفدی عوسمانی بریتی بوو لە (هادی پاشا ود.ڕەزا تۆفیق) ، هادی پاشاش ئەو کەسەیە بە نوێنەرایەتی سوڵتان محەمەد واحدالدین وفرید پاشا ڕێکەوتنی سەربەخۆیی کوردستانیان بەو قۆناغانە لەگەڵ شێخ عبدالقادر

---

[١٤] بڕوانە: (د.کەمال- کورد و کوردستان...) ل٧٦

[١٥] بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە کورد لە بەڵگەنامەی بەریتانیا ژمارە :٤٠، ٥٠٦٨/f٠,٣٧١ بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٩٢٠/٤/٨.

[١٦] کۆمەڵە ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا وفرنساله بەلگەنامەی ژ:٤٤ و ل١٥٩ بڵاوکراوەتەوە

[١٧] د عثمات علی –دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٣٢٥ ، هەروەها بڕوانە بە ڵگەنامەی بریتانی Air٥١٢تەلەگرام لە ١٨/٤/ ١٩١٩.

* سیستەمی ئینتداب کرابووە سێ گرووپ:A ،B، C . ئەوەی عوسمانی گروپی A بوو چونکە ئاستی بە دەولەت بوونیان بەرز تر بوو لە گروپەکانی تر .

[١٨] الأمم المتحدة فی نصف القرن ص٢٥

شەمزینی و شەریف پاشاو ئەمین عالی بدرخان مۆرکرد ، لەبەڵگەنامەیەکی تریی بەریتانی (FO.٣٧١/٥٠٦٧) کە لە ل٣٢٦ی هەمان سەرچاوە هاتوە دەڵی : فەریدپاشا لایەنگیری دروست بوونی دەوڵەتی کوردی کردوە لەرێی ئۆتۆنۆمی ناوەخۆ ، ئینجا دەبێ ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کە سولتانی عوسمانی وفرید پاشا علی ئیحسان پاشایان ڕاسپارد بە بروسکەیەکی فەرمی لە ١٩١٩/١٠/٣٠ مومتەلەکاتی عوسمانیان تەسلیمی حکومەتی شێخ محمود کردو دانیشیان پێدا هێنا ، ئەوەش پەیڕەو کردنی ڕێکەوتنێکی تری عوسمانی و کورد بووە لەبارەی سەربەخۆیی کوردستان ، لەلایەن عوسمانی وەفدێك كە پێك هاتبوو لە شیخ الأسلام صبری زادە ( سەرۆك ) ، وەزیری کار ئەحمەد دەبوق ، وەزیری دەریایی عەونی پاشا ، وەفدی کوردیش بەسەرۆکایەتی عبدالقادر شمزینی و مەولانە رفعت بەگ وئەمین بەگ ، کەواتە هەر هەمان ڕێڕەوە لەسیڤەریش ڕەنگی داوەتەوە ، بەو جۆرە دەچینە نێو گرنگیەکانی سیڤەر .

# گرنگی پەیماننامەی سیڤەر

بە پێی هەندێ سەرچاوە لە پێش و لە دووای جەنگی جیهانی یەکەم سەرجەم نزیکەی ١٠٠کۆنگرە بەسترا بۆ دابەش کردنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ، لەوانە: لیژنەی بنسن ١٩١٥، (سایکس —بیکۆ ١٩١٦) ، (ڤێرسای ١٩١٩) ، (سان ریمۆ١٩٢٠) ، (سیڤەر١٩٢٠) ، (کۆنگرەی قاهیرە١٩٢١) ، (لۆزان ١٩٢٣)، کەچی جگە لە سیڤەر ئەوانەی تر گورز بووە لە کوردستان ، لە سایکس–بیکۆ– سازانۆف ، کوردستان بۆ چەند پارچەیەك دابەشکرا ، لە سان ریمۆ ویلایەتی موسلْ گۆڕا لە بەشی فەڕەنسا وە هاتە سەر بەشی بەریتانیا ، لە کۆنگرەی قاهیرەش عێراقی لیْ دروستکرا ، زۆر سەلبی بوون ، هەتا لە بارەی سیڤەریش وەك د. سعد ئەسکەندەر دەلیْ: بەریتانیا باوەڕی بەو مادانەی (٦٢، ٦٣، ٦٤)[١٩] نەبوو ، د کمال مەزهەریش دەلیْ ئەو ڕۆژەی جاڕی پەیماننامەی سیڤەر درا بریتانیا و فرنسا و ئیتالیا کۆببونەوە بۆ دابەش کردنی کوردستان ، بۆیە ولیام ئیگلتن نا هەقی نەبوە کە وتویەتی سیڤەر بە مردوویی مۆر کرا ، ئەی کەواتە **چی بوو وایکرد ئەو مادانە لە سیڤەر بچەسپێت** ؟ لایەنەکانی بەشدار بوو کاریگەرییان هەبوە ؟ لایەنی نویْ لەو ڕێکەوتنە بەشداربووە ؟ لەگەل زۆر پرسیاری تری سیاسی یاسایی هەلوەستە دەکەین:

لایەنە بەهێزەکانی ئەو ڕێکەوتنانە بە بەشداری بەریتانیا و فەڕەنسا و ڕوسیا و ئیتالْیا و جارجار ئەمریکا بوە ، فاکتەری زیادە لە سیڤەر تەنها ئەوەیە ئەم جارە نوێنەری عوسمانی (هادی پاشا) بەشداربووە ، دەبیْ لەوەش وردتر بلْێین ئەو وەفدە نوێنەرایەتی دەسەلاتی ئەستەمبۆلی سولْتانی کردوە ، ئەوکاتە (لە ١٩١٨ تا ١٩٢٢) دوو دەسەلات لەنێو عوسمانی دروست بوو ، یەکێکیان لە ئەنقەرە بە سەرۆکایەتی مستەفا ئەتاتورك و سەرۆك وەزیرانەکەی عیسمەت ئینینۆ ، ئاڕاستەیەکی عەلمانی تورکچیاتی هەبووە ، دەسەلاتی دووەم لە ئەستەمبۆل بە سەرۆکایەتی سولْتان

[١٩] سیاسة البریطانیة العظمی تجاه مستقبل کردستان ص٢٢٦ .

محەمەد واحدالدین و سەرۆك وەزیران فەرید پاشا( کە ئاراستەیەکی ئیسلامی کلاسیکی هەبوو) ، هەڵبەتە دەسەلاتی ئەنقەرەی ئەتاتورك زۆر دژی سیڤەر بوو ، هادی پاشا نوێنەری سوڵتان بوو نەك ئەنقەرە ، ئەو پیاوە لەپێشتریش لە رێکەوتننامەی لەگەڵ نوێنەرانی کورد بەسەرۆکایەتی (شێخ عبدالقادری شەمزینی )* کردبوو ، هادی پاشا و سوڵتان دۆستی کورد بوون ، بۆیە بەپێی توێژینەوە مەیدانیەکان کە پێی هەڵساوین لە نێو بە سالاچوەکانی کوردی سەروو ، وادەردەکەوێ کاریگەری شێخ عبدالقادر و شریف پاشا و شێخ سەعید و شێخ نەورەسی و.. کۆمەڵێك کەسایەتی کوردی تری ئایینی و نیشتمانی وایکردوە سوڵتانی عوسمانی هادی پاشا بنێری لەوێ لەسەر هەر سێ ماددەی (٦٢، ٦٣، ٦٤) مۆربکا و کوردستانیش بپاڵێوێ بۆ دەوڵەت بوون[٢٠] ، ئەوە هۆیەکی گرنگ بوو کە سیڤەر ئەو رەوتەی وەرگرت ، ئەگینا نە نوێنەری کورد لەو کۆنگرەیە بەشداربوو نە دۆستێکیش ، بە پێچەوانەی رای رەفیق حلمی کە دەڵێ شریف پاشا بەشدار بوو لەو کۆنگرەیە بۆیە مادەی باشی تێکەوت ، نەخێر ئەوکاتە (شەریف پاشای دیپلۆماسی کورد ) تووڕە ببوو بەقسەی (کریس کۆچیرا) لە رقی ئەوەی بەشێکی کوردستان درابوە ئەرمەنەکان ئیستقالەی دابوو لە ١٩٢٠/٤/٢٧وە [٢١]، زیاتر شیخ عبدالقادر و (ئەوەی ناویان نرابوو کوردە ئەستەمبۆلیەکان) ڕۆلیان بینی هەم لە ڕێی هادی پاشا هەم خۆشی ڕاستەوخۆ لە هەمو لایەك لە تەقەلادا بوو ، ئەگەر بە ووردی سەرنج بدەینە نامەکەی عبدالقادر —کە بەناوی سەرۆکی کۆمەڵەی کوردی ناردووە بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە ١٨-١٩٢٠/١/٢١ دەبینین ناوەڕۆکی مادەکانی (٦٢،٦٣،٦٤)ی زۆر لێ نزیکە[٢٢] ، رۆژئاوا و ولاتانی بەشدار بوو هەڵوێستیان بەرامبەر کورد باش نەبوو (وەك لە کۆنگرەکانی تر بینیمان) ، هەر لە ناکۆکیەکانی نێوان

---

* سەرۆکی ئەنجومەنی دەوڵەتی عوسمانی بوو و لەبنەماڵەی شیخ عبیداللەیە .

[٢٠] بۆ زیاتر پشتیوانی : بڕوانە کوردستان من بداية الحرب العالمية الأولى الى نهاية مشكلة الموصل – ص١٧٧

[٢١] القضية الكوردية فى المؤتمرات الدولية .هەروەها لە( کوردو کوردستان لە بەلگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بریتانی — د کمال مەزهەر) دا هەمان بەرواری ئیستقالەکەی دیاری کردوە .

[٢٢] دەقی نامەکە لەکتێبی(کۆمەلەو ڕێکخراوە کوردیەکان ١٩١٨-١٩٣٣لە بەلگەنامەی بریتانی وفرنسی )- ل١٥٨-١٥٩ بەلگە نامەی ژ:٤٤

عوسمانی لەلایەك و (میری سۆران و محمد پاشای میسر ) لە لایەکی ترەوە تا دەگاتە کۆنگرە نهێنیەکانی سایکس بیکۆ بە دواوە ، لە کاتێکدا هەلویستی ڕۆژئاوا جار و بار باش دەبوو بەهۆی کاریگەری سەرکردە ئاینیەکانی کورد ، وەك ئەو نامەیەی کە شێخ عبدالقادر بۆئاشتی و سان ریمۆی ناردبوو ، دەبینین هەلویستە چاکەکان لەو سەروبەرە بووە ، وەك پرۆژەی کیرزن لە بارەی کورد لە نیسانی ١٩٢٠ ، بڕیاڕی (ئەنجومەنی باڵای هیزە هاوپەیمانەکان) کۆتایی مانگی ١٩١٩/١ ، ئەوەش شان بە شانی لایەنگری فرید پاشا و سولتان بۆ سەربەخۆیی کوردستان لە ڕێی ئۆتۆنۆمی[٢٣] ، لە ڕاستیدا ئەوەی عوسمانی بە کوردی دا هەر لە ڕێکەوتنی نێوان سولتان عبدالحمید و ئەمیر عوسمانی کورد[٢٤] ، هەروەها پرۆژە هاوبەشەکەی ئەفغانی و نەورەسی و سولتان بۆ جامیعەی ئیسلامی ، زۆر فراوانتر بوو لەوەی سیڤەریش ، لە سیڤەر هادی پاشا هەولی دا ویلایەتەکانی ئامەد و بتلیس و وان بدرێتە کورد کەچی هاوپەیمانان بە ئەرمەنیان دا ، بە پێی بەلگە نامەی ئەمریکی fo٣٧١/٣٧٨١ سنوری کوردستان ئەو ویلایەتانەی دەگرتەوە ، بەڵام هاوپەیمانان نە بە گوێی عوسمانیان کرد نە بە ئەمریکا ، بەلکو گەڕانەوە سەر مادەی ١٦ و٨١ ی کۆنگرەی بەرلینی ١٨٧٨ کە بە ئەرمەنی دابوو ، بەو شێوەیە ئەوەلیاتی ئیجابیەکانی سیڤەر لەوانە دێت ، بۆیە هیچ لێکدانەوەیەك هەڵناگرێ جگە لەوەی کە نوێنەری عوسمانی خۆی داکۆکی لە ماڤی کورد کردووە ، باشترین بەلگەی تر ئەوەیە هەرکاتێ نوێنەری عوسمانی ئامادە نەبووبێ هەلوێست بەرامبەر کورد گۆڕاوە ، لەلایەکی تریش نامە و بروسکەی سەرکردە کوردەکان ئەو کاریگەریەی هەبووە ، قۆناغەکانی بە دەوڵەت بوونی کوردیش لە سیڤەر هەمان قۆناغی هزری (شێخ عبدالقادر شمزینی) یە[٢٥] ، بڕوانە ئەو بەڵگەنامەیەی بەریتانی لە خوارەوە :

[٢٣] بۆ زیاتر لە بارەی لایەنگری فرید پاشا وعوسمانی بۆ کیشەی کورد بڕوانە ل٣٣٨ی کردستان فی سنوات الحرب العالمية الأولى .
[٢٤] بڕوانە محمد ئەمین زەکی بەگ –خولاسەی تاریخی کوردو کوردستان ل١٩٥
[٢٥] بڕوانە دەرسیم لە میژووی کورد- بەیتار دەرسیمی ل١٤٥ و ١٤٦

## من أدميرال دي روبيك ، استنبول ١٨ نيسان / ١٩٢٠ برقية رقم/ ٤٠١

الى \ وزارة الخارجية

اشارة الى برقيتكم

تعقد الموقف بالنسبة القضية الكردية وذلك لحصول الانشقاق داخل النادي الكردي الذي أشرت اليها في برقيتي رقم ٣٠٢.

يتهم البدرخانيون والاخرون من النخبة الكردية السيد عبدالقادر افندي بعدم كونه متعاطفا مع المشاعر القومية الكردية وذلك لما صدر منه بعض التصريحات. يدعي عبدالقادر بأنه يقف كليا مع توحيد كردستان أداريا ولكن يكن الكثير من الأحترام للخلافة ولا يرى اية فائدة في الاستقلال السياسي. يقول عبدالقادر أنه بحاجة الى الدعم البريطاني ويقدره وأنه متى ما شاءت الحكومة البريطانية ودعمت استقلال كردستان فأنه مستعد أن يعلن الاستقلال ولكن في الظروف الحالية ليس هناك اية حاجة لأثارة كل هذا الضجيج حول الاستقلال الكامل. يبدو أن عبدالقادر رجل صادق وأنه بفضل مكانته الدينية أكثر الشخصيات الكردية شعبية وأن خصومه عبارة عن مزيج من القوميين الكرد الذين يحملون افكارا مثالية ودعاة القومية التركية من الذين يعملون للمصالح القومية. في الحقيقة انهار النادي الكردي كليا و أصبح من الان فصاعدا من الصعوبة بمكان ايجاد فئة أو مؤسسة تمثل فعلا الرأي العام الكردي.

أرسل نسخة الى بغداد، رقم ٢٧

**گرنگیەکانی تری سیڤەریش لەم خاڵانەی خوارەوە دەردەکەوێت:**

١- گرنگی خودی سیڤەر لەوە دێت کە وڵاتانی ئێستای ناوچەکە لەسەر ئەو ڕێکەوتنە دروست بوون ، بەو شێوەی خوارەوە:

* کوردستان (نەبووە دەوڵەت) بەپێی مادده ٦٢-٦٤.

* ئەرمینیا لە ماددەی (٨٨ هەتا ٩٣) نەبوە دەولەت ، ئەوبەشەی ئێستا دەولەتە بەری ڕوسی پێ دەلێن .

* سوریا و میزۆپۆتامیا (عێراق) بەپێی مادەکانی ٩٤ هەتا ٩٧.

* ئیسرائیل.. بەپێی ماددەی (٩٥) .
* حیجاز بەپێی ماددەی (٩٨–٩٩) .
* بەو شێوەیە میسر لەمادەی (١٠١) .
* سودان لە مادەی (١١٣) .
* مەغریب و تونس لە ماددەی (١١٨) .
* لیبیا بە ماددەی (١٢١).

جگە لە وڵاتانی ئەوروپی ڕۆژهەڵاتیش هەر بە سیڤەر دروست بوون .

٢– کوردستان و عێراق هەریەکەبە ماددەیەك لە عوسمانی جیابوەتەوە ، کوردستان بە ماددەکانی (٦٢،٦٣،٦٤) ، عێراق بەپێی ماددەی (٩٤) ، ئەوەش لەسەر ئاستی یاسایی و سیاسی و مێژوویی و بەتایبەتی بۆ باری ئێستامان وەك بناغەیەکی یاسایی بۆ فیدراڵی هەرێمی کوردستان دەیسەلمێنێ کە باشوری کوردستان بەشێك نەبووە لەعێراق ، ئەو عێراقە لە دوو هەرێمی یاسایی هاوبەش و دوو گەلی جیا دروستبووە ، کۆتایی بەوگوتارە سیاسیە هەڵەیە دێ گوایە عێراق یەك نیشتمان و یەك میللەتە.

٣– ناوی کوردستان بە ئەدرەسێکی تایبەت لە بەشی سێیەم[*] و لەماددەی (٦٢) دا هاتووە بە ناوی (کوردستان)، لەپێش هەموو وڵاتانی ( ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا ) ، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و... لە وڵاتانی تر پێگەیشتووتر بووە، یان بەلایەنی کەم لەوان کەمتر نەبووە ، کەچی دەبینین لەدوای کوردستان ناوی عێراق و سوریا و فەلەستین بە ئەدرەسێکی هاوبەش هاتووە لەماددەی (٩٤–٩٧ )ی بەشی حەوتەم ، ئینجا عێراق و سوریا و وڵاتانی تری پاڵێوراو بوون بۆ دەوڵەت لەرێی ئینتداب کە لە ماددەی (٢٢)ی کۆمەڵەی نەتەوەکان بە سێ پۆلی (A, B, C) دیاریکرابوو ، عێراق لەپۆلی (A) بوو ، بەڵام کوردستان لەبەر پێگەیشتنی و بوونی دەسەڵاتی سیاسی و هەرێمێکی دیاریکراو بەناوی (کوردستان) سنورەکەی دیاربوو[*] .. ئەوا پێویستی بە ئینتداب نەبووە.

---

[*] لە بەیانی فیدراڵی پەرلەمانی کوردستان ئاماژەی بەو مادانە کردووەو ووتوویەتی لەبەشی چوارەمی سیڤەرە ،کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیە لە بەشی سێیەمە .

[*] بێجگە لەفەرهەنگی وڵاتانی تر خودی فەرهەنگی ئیداری وسیاسی عوسمانی کۆن ونوێ ،دانیان

٤- سنوری کوردستان بەپێی ماددەی (٦٢) دیاریکرابوو کە دەکاتە خوارووی سنوری تورکیا و ئەرمینیا و رۆژهەلاتی فورات ، ئەو سنورەش تارادەیەکی زۆر گوزارش لە سنوری راستەقینەی کوردستان دەکات ، هەرچەندە بەشێك پێیان وایە ئەو سنورە تەنها کوردستانی سەروو دەگرێتەوەو مەبەستی لە رۆژهەلاتی فورات کوردستانی خوارو ویلایەتی موسڵ نەبووە ، ئەوە بە هیچ جۆرێك راست نیە، چونکە زۆر بەروونی باسی ئەو سنورە دەکات تا میزۆپۆتامیای عەرەبی ، ئینجا لەسەر ئەو بنچینەیەش (چەرچڵ) بروسکەی بۆ سەرکردە عەسکەرییەکان کرد لەسەروی بەغداو پێش ئەوەی بگەنە چیای حەمرین ، وتی لەو سنورە بەسەرەوە عێراق نیە و کوردستانە ، هەر لەسەر هەمان بنچینە (چەرچڵ) لە کۆنگرەی قاهیرەی ١٩٢١/٣/٢٤ داواکەی برسی کۆکس و مس بل و نیلسۆنی راگرت سەبارەت بە لکاندنی باشوری کوردستان بە عێراق بەپێی ئەو ماددەیەی سیڤەر و بەپێی نەخشەی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامی و بەپێی نەخشەی ویلایەتەکانی عەباسی کە (عێراقی دیاریکردووە)، بەپێی نەخشەی عوسمانی ١٨٩٣ بەپێی گەڕیدە و (معجم البلدان ، سیاحەتنامە و ئەنسیکلۆبیدیای عوسمانی و زۆر سەرچاوەی تر) ویلایەتی موسڵ و بەسەدان کیلۆمەتر لە خوارووی موسڵ و کەرکوك کوردستانی بووە * ، لەدوای سیڤەر و لەگەڵ بەدەوڵەت نەبوونی کوردستان و بە دەوڵەت بوونی عێراق و سوریا و تورکیا (لەسەرەتای سەدەی بیست) لەسەردەستی بەریتانیا و فەڕەنسا و تا ئیستاش ئەو سنورەی کوردستان هەروا تەسك دەکرێتەوە ، وەك ئەوەی ئیستا لە موسڵ روودەدا و کەرکوکیش وا کەوتوەتە جێ ناکۆك و ململانێ .

بەکوردستان نابوو، سنوریشیان دیاری کردبوو ،لەکۆنەوە لەلایەن ئۆلیا چەلەبی لە سیاحەتنامە هاتبوو ،لەنوێش لە هەردوو نەخشەی سیاسی ١٨٩٣ و١٨٩٦ سنوری کوردستان زۆر بەگەورەیی هاتبوو ،هەروەها لە فەرهەنگی عوسمانیش لە (قاموس الاعلام)ی شمس الدین سامی لە مادەی :کوردستان سنوری کوردستان بە ووردی دیاری کراوە چەندە گەورەیە ،بۆیە ناوی کوردستان لە سیڤەر گوزارشی لە باکگراوندی بەهیزی سەردەمی عوسمانی دەکرد .

* لە قاموس الاعلامی عوسمانی دەلێ تەواوی ناوچەی موسل سەر بەهەرێمی کوردستانن بە عەرەبەکانیشەوە ،باسی ویلایەتی موسل بە ویلایەتی موسلی کوردستان دەکا ،باس لە کەرکوکیش دەکا دەلێ شارێکی کوردستانیە و٣/٤ی کوردن،ئەوەی تریشی تورك وعەرەبن،٧٦٠ ئیسرائیلی و٤٦٠کلدانی لێیە .

٥- ناوی عێراق لەو ڕێکەوتننە (لەگەڵ ڕێکەوتنەکانی تریش) نەهاتبوو ، کەچی مێژونووسە عەرەبەکان تەرجومەی (میزۆپۆتامیای عەرەبی) بەعێراق دەکەن و سەروەرییەك بەناوی عێراق دەدەن ، گوایە پێش ساڵی ١٩٢١ عێراقی سیاسی هەبوبێ ، لەبەرئەوەی ناوی عێراق و ئەو وڵاتانەی ئیستای ناوچەکە نەبووە ، بۆیە دەبینین لە ڕێکەوتننامەی سایکس-بیکۆ ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست لەسەر بنچینەی (A, B و ڕەنگی شین و سور) دابەشکران ، تەنانەت لەسەردەمی عوسمانی ویلایەتێکیش نەبوو بەناوی عێراق ، چونکە لە بنەچەدا ناوی عێراق لە وشەی (ئەراك)ی فارسی هاتووە ، پەیوەندی بە دانیشتوانە عەرەبی و ڕەسەنەکەی نەبووە ، کەچی کوردستان نەك ویلایەت بەڵکو لە ئاستی ئیالەت[٢٦] بووە ، کە بریتی بوو لە (٥) ویلایەت بە پێی دوانامەی شیخ عبد القادر شمزینی بۆ سەرۆکی کۆمیسیۆنی باڵای کۆنگرەی ئاشتی[٢٧] بریتی بووە لە :ناوچەکانی ئامەد و بەتلیس و خەربووت و وان و موسل ، هەرچی ناوچەکانی جزیرە و بۆتان و نێوان هەردوو زێی دیجلە و فورات تا بەغدا بە میزۆپۆتامیا حساب کراوە[٢٨] هەر لەسەر کورد حیساب بووە .

ناوی میزۆپۆتامیا لەلایەن لەشکری زینفونەوە هاتووە وا پێدەچێ بە ( جێگۆرکێوە ) لە جەزیرە و بۆتانیا هاتبێ[٢٩] ، لەبەر نەبوونی ناوێکی تر ناچار ئەو ناوچانەی بەغدا و خوارووی بەغداش لەسەرەتای سەدەی بیستەم بە میزۆپۆتامیای عەرەبی هاتووە ، لە ڕێکەوتننامەی سایکس-بیکۆوە سنوری میزۆپۆتامیای عەرەبی لەماددەی (١) و (٢) و بەپێێ نەخشەکەش دیاریکرا کە بەشێك لە هەردوو ویلایەتی بەغدا و بەسرەی گرتەوە ، ئەوەی لە سیڤەریش هات ئەو سنورە بوو ، بۆ یەکەم جار ناوی عێراق لە نێو ڕێکەوتنامەی دەولی لە لۆزان هات لە دووشوێن .

٦- وەك بەڵگەنامەیەکی بەهێزیش دەسەلمێنێ کە ئەو کوشتارەی لەگەڵ ئەرمەنی کرا نە کورد بووە نە عوسمانی ، بەڵکو ئیتحادالترقی بووە ، کە دوایی ئەو تورکیایە نوێیەی لێدروست بوو ، لەمادەی (١٤٢) بەهۆی کوشتاری ئەرمەن و بەشداری جەنگی

[٢٦] بڕوانە: قاموس الاعلامی عوسمانی - مادەی کوردستان -دەڵێ لە ئاستی ئیالەت بوو .
[٢٧] دەقی نامەکە لە (کۆمەلەو ڕێکخراوە کوردیەکان لە بە لگەنامەی بریتانی وفرنسی) ل١٢٣
[٢٨] الإسلام والعلمانية واثرهما فی نشأة الدولة العراقية الحديثة ص١٩٦ هەروەها بڕوانە نەخشەی سیڤەر . هەروەها بڕوانە :عبداللة ئۆجەلان — من دولة الكهنة السومرية الى الحضارة الديمقراطية ص٣٥٢
[٢٩] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو- ص١٩٦ .

جیهانی دەسەلاّتی ئیتحادیەکان بە (تیرۆریست) تۆمار دەکا ، ئینجا قەرەبۆش دەخاتە ئەستۆی هەر هەموو ئەوانە لەمادەکانی (٢٣١–٢٥٧) سیفەر– سەبارەت بە تورکیا هاتوە ، کەچی لە بەشی سێیەمی کوردستان هیچ باسێکی بەرپرسیارێتی لەو تاوانەی تێدا نیە.. ئەوەش بەڵگەیەکی تری سەربارە کە کوردستانی فەرمی بەشدار نەبووە لەو تاوانە هەروەك بەشێکی گ رنگ لە مێژوونووسان و سیاسەتمەدارانی هاوچەرخی کوردیش بە هەڵە ئەو بەرپرسیاریەتیە لەسەر تورکیا لادەدەن و دەیخەنە ئەستۆی کورد و یارمەتی تورکیای پێ دەدەن* .

٧– ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی ئیستا بەو رێکەوتن و کۆنگرە و مادەکانی سیڤەر دروستکراون ، بەهەمان مادده و رێکەوتن ئیسرائیلیشی پێ دروستکرا (لە ماددەی (٩٥) باس لە جێبە جێ کردنی بەڵێنی ٢/ تشرینی / ١٩١٧ دەکا) ، ئەوەش دەقی بەڵێنی بەلفۆرە ، هەرچەندە لە رێکەوتننامەی سیڤەر ناوی بلفۆر و دەوڵەتی ئیسرائیلی تێدا نەهاتوە ، خۆشی ئەوکاتە نەبوو ، تا لە ١٩٤٨ هاتەدی ، بەلاّم لەبەلفۆر ئەو مادەش داکۆکی لە دروست بوونی قەوارەیەکی نەتەوەیی بۆ یەهوودیەکان دەکاتەوە لە فلستین .

٨– هەر تەوژمی عوسمانی و سیڤەربوو وای کرد بەریتانیا حکومەتی شیخ محمود بە حوکمدار* بناسێ ، ئینجا لە مادەی ١٦ی چەکی ئینتدابی (صك الانتداب) دان بە حکومەتی کوردستان نرا ، لە مادەی ٤ی دەستوری عیراقی سالی ١٩٢٥بەگوزارشی دووئەستێرە لەسەر ئالاّی عیراق دا نرا بە هاوبەشی کورد و عەرەب لەو عێراقە ، لە ١٢/٢/ ١٩٢٢ دووبارە بریتانیا و عیراق لە بەیانێکی هاوبەشدا پێکەوە دانیان بە حکومەتی کوردستان نا ، لە ٤/١١/ ١٩٢٢ شێخ محمود وەك مەلیکی کوردستان خۆی

* یەکەم جار عیسمەت ئینینۆ لە کۆنگرەی لۆزان ووتی کوشتاری ئەرمەن لە ئەستۆی کوردە نەك تورك ،کەچی ئەو نوێنەرە کوردەی لەگەلیدا بوو تاوانبار بوو بە کوشتنی ئەرمەنی، وەك لەو ڕاپۆرتەی ئەمریکی وەسفی نوێنەرەکان دەکا : نوینەرەکانی تورك لە لۆزاندا ٢٧کەس بوون بەسەرکردایەتی عیسمەت ئینونو- دکتۆر رەزانور- حسن ساکا ،ئەوەی نوینەرایەتی کوردی دەکرد( پرنچی زادە فەوزی) و( تیگرل بەگ زولفی بەگزادە) نوێنەری دیاربەکر بوو لە پەرلەمانی تورکیادا کە پێشتر لەسەرتاوانباری ئەرمەنی کوشتن ئینگلیزەکان لەساڵی ١٩١٩ لەکەمپێکا دەست بەسەریان کردبوو .

* بەشێکی زۆر لەمێژوو نووسی کوردو عەرەب بەرزبوونەوەی حکومەتی شیخ محمود و پلە دانی(حوکمدار) بۆ بەریتانیا دەگێڕنەوە،کەچی زۆر پێش بەرواری هاتنی بەریتانیا بۆ سلێمانی نامەی شێخ محمود هەیە مۆری(حوکمداری)پێوەیە .

ناساند ، لەمانگی ١٩٢٥/١٢ کۆمەلەی نەتەوەکان دانی نا بەوەی کە خەڵکی کوردستانی عیراق مافی دامەزراندنی حکومەتیان هەیە ، لە لیژنەی نێوبژیوانی ویلایەتی موسل دیسان لە ل[٥٧] ی ڕاپۆرتەکەیاندا دان بە هەق بوونی حکومەتێکی کوردی نراوە ، هەروەها بەڵێننامەی ٩ و١٠عیراق لەپێناو وەرگیرانی لە (عصبە الامم) لە ١٩٣٢...لەگەل زۆری تر .

٩- جگە لەو ٣ مادەیەی سەبارەت بە کوردستان ، دەتوانین بە مادەی تری سیڤەر مافەکانی ئیستامان پێ بهێنینە دی ، هەر بە نمونە مادەی ١٤٥پەیڕەو بکرێ تەواوی کێشەی کورد و کەمایەتیەکانی تریش لەو ولاتانە چارەسەر دەبێ لەو قۆناغە ، کە دەڵێ: هەلبژاردن بکرێ بە پێی (تمثیل النسبی) بۆ کەمایەتیەکان پەیرەو بکرێ ، ئەوەش ماناکەی ڕوونە دیموکراسیەتی تەوافوقی دەبەخشێ کە دان پیا هێنانە بە (هاوبەشی).

١٠- ئیجابیاتی بۆ ئیستا یەکجار زۆرە ، لە دوای دابەش کردنی کوردستان نەك هەر سیڤەر بەلکو ڕێکەوتنذامە خراپەکانی ئەوساش ئیجابیە بۆ باری یاسایی ئیستای کورد ، هەر لە سایکس پیکۆ و میساقی نیشتمانی تورکی و لۆزان و بەڵێننامەکانی عیراق بۆ (کۆمەلەی نەتەوەکان) و...، بەلام لە هەمووی گرنگ تر سیڤەرە ، دەبێتە پالپشتی یاسایی و سیاسی بۆ هەموو قۆناغەکانی مافی چارەنوسی کوردستان ، هەر لە لامرکزی وئۆتۆنۆمی وفیدراڵی تا دەگاتە بە دەولەت بوون .

١١- لەمێژووی عیراق تەنها لەسەردەمی عەباسی عیراق ویلایەت بوە ، ئەویش تا تکریت بوە ، کوردستانی نەگرتوەتەوە ، تاکە بەلگەیەك لەدەست شۆڤینی عەرەب سەبارەت بە عیراقی بوونی کوردستانی خواروو تەنها ئەو بەلگەنامەی نێوان (شریف- ماکماهۆن)* ە ، گوایە لەو ڕێکەوتنامەیە ناوچەکانی ئامێدی تا دیاربەکریشی بە شریفی مەکەی باوکی مەلیك فەیسەل دراوە...، لەڕاستیدا لە ڕێکەوتنامەکە ئەو ناوچەیەی تێدانەبوو ، بەلکو ئەوە پێشنیاری هەردوو حزبی عەرەبی (الفتاة والعهد) بوو کە بە (میساقی دیمەشق) بەناوبانگ بوو ، بۆ شریف نێردرابوو ئەویش بۆ ماکماهۆنی ناردبوو ، ئەویش وەلامی نەدانەوە ، بەلام ئەو گومانە لەسیڤەر بەیەکجاری دەڕەوێتەوە ، کاتێ

* شریف حسین کوری علی لە١٩١٥ریکەوتنامەیەکی لەگەل بەریتانیا بەست لە ڕێی ماکماهۆن .

دە بینین شریفی مەکە خۆی یان مەلیك فەیسەلی کوڕی لە سیڤەر بوە و ناڕەزا نەبوە بەوەی کوردستانی خوارووش بە مادەی جیا لەگەل عەرەب وعیراق جیا ببێتەوە .

## سەلبیاتەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیە

تا بەستنی کۆنگرەی سیڤەری ١٩٢٠ ئەو ماددانە ئەوەندە گرنگ نەبوون بۆ کورد ، چونکە مێژووی سیاسی کورد لەو مادانە زۆر گەورەترە ، لەو کات و پێش ئەویش لە بنەماکانی جامیعەی ئیسلامی* لە شێوەی وولاتانی کۆنفدرالی ، لە رێکەوتننامەکانی عوسمانی و کوردا لەسالأنی ١٩١٢–١٩٢٠ دووبارە مافی سەربەخۆیی کوردستان بەتەواوی هاتبوو لە ڕێکەوتنێکی نێوان نوێنەرانی کورد کەپێك هاتبوو لە:عبدالقادر شمزینی (سەرۆك) ، ئەمین عالی بدرخان ، مراد بدرخان ، مەولان زادە رفعت بەگ ، لە لایەن نوێنەرانی عوسمانیش پێك هاتبوو لە : دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی شیخ الأسلام صبری زادە(سەرۆك) ، ئەحمەد عبوق پاشا ، عونی پاشا لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی[٣٠]. لە هەموو ئەو رێکەوتنانە کوردستان سەربەخۆیی پێدرابوو ، سولتانی عوسمانی بەفەرمی دانی بە دەسەلاتی شێخ مەحمودیشی هێنا بوو لەسالی ١٩١٧–وە ، بۆیە ئەو مادانەی سیڤەر لەچاو باری سیاسی کورد ئەوکات و پێشوتر ئەوەندە گرنگ نەبوو ، واتە خێری پێ نەکرابوو لەو مادانە ، بەلام لەدوای ئەوەی کوردستان بە گەلەوە دابەش و بێبەش کرا ، ئینجا هەموو ئەو ڕێکەوتنانە بوونە سەنەدی یاسایی بۆ کەمێك لەمافەکانیان ، هەتا سایکس–بیکۆش چەندە سەلبیە کەچی بۆ باری ئێستامان سود مەندە وەك سەنەدێکی یاسایی نێو دەولەتی بۆبناغەی بە فیدرالی بوونی هەرێمی کوردستان ، ئەگەر یاساناسێکی وریا و زیرەك هەبێت .

---

* ئەو جامیعەیە لەلایەن (سولتان عبدالحمید ، جمال الدینی ئەفغانی، شێخ سعید نورسی ،ابو الهدی الرفاعی،الشیخ محمد الظاهر،الشیخ اسعد قیصلی،...) دروستکرا .

[٣٠] د کمال مظهر ( کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الأولی ) ص٣٤٣ ، هەروەها (کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الأولی الی نهایة مشکلة الموصل) –سروة اسعد صابر

لەسەر ئەو بنچینەیە ناوبانگی سیڤەر وا بە باشی دەنگی دایەوە تا ئەو رادەیەی خەڵکی ناوی (سیڤەر) لە منداڵ و دوکان و بازاڕ بنێ ، ئەگینا لەچاو ئەوسا دیسان سەلبیاتی زۆربووە ، بەپێچەوانەی ڕای زۆر لە نوسەر و مێژوونوس و تەنانەت لە بەیانی فیدراڵی پەرلەمانیش کە لە ١٩٩٢/١٠/٤ دەرچوە ، وەسفی سیڤەر دەکاو دەڵێ هەموو بەشەکانی کوردستانی یەك دەخستنەوە ، وەك لە خوارەوە لە دیاری کردنی سەلبیاتەکانی دەبینین ئەو بۆچونە هەڵەیە:

١- سیڤەر کوردستانی یەکنەخستەوە ، جارێ بەلای بەشی کوردستانی رۆژهەڵاتدا نەچووە کە لەژێردەستی ئێران بوو ، هەروەها بەری ڕۆژئاوای فوراتی نەدەگرتەوە کە ئێستا کەوتۆتە ژێردەستی سوریا ، بە مەبەستی ناڕەزایی دەربڕین لە دابەشی کوردستان (کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی کورد) لە ١٩٢٠/١/٢٨ ناڕەزایی بۆ کۆمیسیۆری بەرزی حکومەتی بەریتانیا ناردووە [31]، هەروەها چەند لایەنێك لەوانە حزبی دیموکراتی کوردی ئەوسا ( لە باکوور) لەگەل لیژنەی (کنگ-کراینی ) ئەمریکی دانیشت بۆ ئەو مەبەستە .

٢- بەشێکی گرنگی لە خاکی کوردستان بەپێی مادەی ٨٩ لە ویلایەتەکانی ئامەد و بتلیس و وان دایە ئەرمینیا کە جاری وایە بە (پەیمان بلفۆر) ێکی تر وەسف دەکرێ ، ئەو ناوچانە کوردستانین هەتا ئەرمەنییەکانیش دەزانن ، بۆیە لەپەرەگرافی (ب)ی مادەی (٢)ی رێکەوتننامەی ساڵی ١٩٢٧/١٠/٢٩ بزوتنەوەی تاشناقی ئەرمەنی و بزوتنەوەی (خۆیبون)ی کورد هەڵوەشێنرایەوە [*]، بەو شێوەیە لە سیڤەریش کوردستان کرایە (٦) پارچە ، بەڵام پارچە سەرەکیەکە وەك خۆی مایەوە .

٣- نوێنەری کورد لەو رێکەوتنامەیەدا نەبوو ، لەکاتێکدا نوێنەری ئەرمینیا وحیجازی تێدا بوو ، بەڵام نوێنەرانی عێراق و سوریا و باقی وڵاتانی عەرەبی تێدانەبوو.

٤- باس لەماوەی (٦مانگ) بۆ لیژنەی (٣) قۆڵی بەریتانی ، فرنسی ، ئیتالی ، و دوای سالێك راپرسی دەکا[32] ، لەکاتێکدا بۆ وڵاتانی تر ئەوەی پێویست نەبووە ، بۆ ناوچەی (سمیرنا) ئەزمیری ئێستا لەو شێوەیە بوو ، کەچی تا ئەو شەش مانگ و

---

[31] بڕوانە دەقی نامەکە لە ل١٠٩ی کتێبی ( کۆمەلەو ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەلگەنامەکانی بریتانی و فرنسی ) .

[*] ئەو ڕێککەوتنە پێك هاتبوو لە ١٩ مادە بە مەبەستی هاوپەیمانی نێوان کوردو ئەرمەن .

[32] بڕوانە مادەی ٦٢ و ٦٤ی سیڤەر

لێژنانە هاتە کایەوە دەسەڵاتی عوسمانی نەما و دەسەڵاتی ئەتاتورك هات و شکستی پێهێنا.

٥- لەدوای ئەو رێکەوتنامەیە لە کۆنفرانسی لەندەنیش ئەو خاڵانەیان باس نەکردەوە دواییش پابەند نەبوون پێیەوە ، تەنها ئەوەندە نەبێ بەو هۆیەوە چەرچەڵ لە کۆنگرەی قاهیرە ١٩٢١ لکاندنی باشوری کوردستانی کەمێك دواخست ، دوایش چەرچڵ لە حکومەت نەما.

٦- دەبێ لەیاد نەکەین هەموو ئەو زنجیرە کۆنگرانە کە لە کۆنگرەی سایکس-بیکۆ تا لۆزان بۆ دابەشکردن و لاواز کردنی دەوڵەتی عوسمانی و لەناوبردنی خەلافەتەکەی و دواخستنی ناوچەکە کراوە ، کوردیش بەشێکی ئەکتیڤی ناوچەکە بووە ، بەڵام بەهۆی ئەو بارودۆخە سیاسیەی کورد تێکەوت ، ئەو زیانە گشتیانەی لەبیر چووە لەبەر ئێش و ژانی تایبەتی خۆی ، هەر لەو زنجیرە کۆنگرانەش بوو کوردستان دابەشکرا.

٧- ئەو لیژنانەی لە مادەی (٦٢) پێشنیارکرا دەست بەکار نەبوون ، راپۆرتی داواکاری کوردەکان لەماوەی ساڵێك نەدرا بە (عصبە الامم) ، لە بەڵگەنامەکانی (عصبە الامم) کە لەبەردەستدایە تەنها ئەو داواکارییەی ١٩٢٥/١٢/١٦ لەو سەردەمە کەمتر پاڵپشت کراوەتە سەر مادەکانی سیڤەر ، لەلای کورد دەنگ و سەدایەکی زۆری نەبووە.

٨- هەروەك لە مادەی (٦٢) هاتووە بۆ لادانی هەر ئاستەنگێك لەبەردەم پەیڕەوکردنی ئەو مادانە وا بڕیار بوو هەرسێ لایەنی (بەریتانیا و فرنسا و ئیتالیا) راپۆرت بەرز بکەنەوە بۆ دەوڵەتەکەیان.. ئەوەشیان نەکرد.

٩- هەر (٥) مانگ دوای سیڤەر و مانگێك پێش کۆنگرەی قاهیرە برسی کۆکسی (حاکمی بەریتانیا لە عیراق) بەنوسراوی فەرمی ژ:٣٣٣٠/٤ی ١٩٢١/٢/٢٢ دەنێری بۆ حکومەتی تازەی عیراقی و فەرمانیان پێ دەکا کوردستانی خواروو بخەنە سەر عیراق .

١٠- ئەوەی زۆر گرنگە بووتریٚ دەبینین لەمادەی (٢٧)ی سیڤەر خۆی سنوری نێوان تورکیا و میزۆپۆتامیای عەرەبی (عیراقی ئیستا) دیاری دەکا وەك ئەوە وابێت کە مادەی ٦٢ هەر بوونی نەبێت سەبارەت بە سنوری کوردستان .

# وەرچەرخانێكی ترسناك لە سیڤەرەوە بۆلۆزان

## (ئەو ئەدرەسە هاوتایە لەگەڵ وەرچەرخانی دەسەڵاتی عوسمانی بۆ توركیای نوێ)

لەو كات و ساتانەی مۆركردنی سیڤەر بەدواوە كەمال ئەتاتورك وەك ئەفسەرێكی نیشتمانی بەهێز بەو واقیعەی عوسمانی تێكەوتبوو قایل نەبوو ، پاڵی دایە شاخەكانی كوردستان و ئەنادۆڵ و توانی سەركەوتنی مەزن بەسەر سوپای یۆنانیەكان بەدەست بهێنێ ، ناوبانگی پەیدا كرد ، لەسەرەتادا گوتاری ئایینی بەكاردەهێنا ، بەڵێنی درۆی بەكورد دا ، نیازەكانی خۆی تاساڵی ١٩٢٤ بە تەواوی بەدەرنەخست ، كە نیازی وایە كۆتایی بە خەلافەت بهێنێ و رژێمێكی عەلمانی توند لە دەوڵەتێكی مۆدێرنی توركیا پەیڕەو بكا ، تیایدا زمان و فەرهەنگی میللەتانی تری لێ قەدەغە بكات ، ئەو پیاوە جەماوەرێكی زۆری پەیداكرد و جارپیشی دا كە رێكەوتننامەی سیڤەر بۆ توركیا مەرگە ، بە هەموو شێوەیەك لەدژی وەستا ، كەوتە دژایەتی سوڵتانیش لە ئەستەمبۆل وبەخائن ناوی دەبرد چونكە (نوێنەری سوڵتان –هادی پاشا) سیڤەری مۆركرد بوو ، دەستی كرد بە جموجۆلی سیاسی و عەسكەری و جەماوەری لەناوەخۆ و لەسەر ئاستی ئیقلیمی و جیهانیش بێ وچان لە تەقەلادا بوو ، لە هەردوو ئاستدا سەركەوتنی مەزنی بەدەستهێنا ، دوو كۆنگرەی خۆ دروست كردنی لە كوردستان بە پشتیوانی كوردە عەلمانی و سەرەك عەشیرەتەكان بەست ، بەرەبەرە ئەستەمبۆل و سوڵتانی لاوازی پەراوێز كرد ، ئەنجومەنی گەورەی توركیای دروستكرد لە مانگی ١٩٢٠/٤ بەناوی (بێۆیچ توركیلی مجلسی) ، بارەگای هەموو ئەو دام و دەزگایانەی لە ١٩٢٠وە بەرە بەرە خستە ئەنقەرە ، لەناوەخۆ لایەنە عەلمانیە كوردەكان و عەشایرەكانی بۆ لای خۆی كێش كرد ، بەرەبەرە خەڵكی بە سوڵتانەوە نەهێشت ، لەسەر ئاستی ئیقلیمی و جیهانیش ئەمریكا و یۆنان[٣٣] و ئیتاڵیا و فەڕەنسا سارد بون لە سیڤەر و پێیان وابوو زۆر لە قازانجی بەریتانیایە ، ئەتاتورك دەستی كرد بە سەودا و رێكەوتن و چارەسەری

[٣٣] هەرچەندە یۆنان دەیوت سیڤەر لە قازانجی بەریتانیایە، بەڵام هەر داوای جێبەجێ كردنی دەكرد و وەك دیڤید ماكدۆناڵد دەڵێ سەرۆك وەزیرانی ئەوكاتی یۆنان لایەنگیری دەوڵەتێكی كوردی بوو.

کێشەی سنور ، لە ١٩٢١/٣/١٣ لەگەڵ ئیتاڵیا رێکەوتن ، لە ١٩٢١/٣/١٦ قرمی دا بە روسیا، لەگەڵ فەرەنسا لە ٢٠/ ١٩٢١/١٠ رێکەوتن و کلیلکاشی دا بە فەرەنسا ، لە ١٩٢٠/٥/٣٠، لە هەمان کاتدا بە مادەی (٢٢)ی عوصبەالامم ومەرجەکانی ئینتدابی لەسەر میراتەکانی قایل بوو.. بەو شێوەیە خۆی توندوتۆڵ کرد و داوای ویلایەتی موسڵیش کردەوە و دوایی وازی لێ هێنا ، روسیا و ئەمریکا دژایەتی سیڤەریان کرد ، بەریتانیا و فەرەنساش ساردبونەوە نەوەك تورکیا بکەوێتە باوەشی روسیای بەلشەفی ، بەپێی هەندێ سەرچاوە هەموو ئەو کار و کردەوانەی ئەتاتورك بریتی بوو لە رێکەوتن و سیناریۆیەکی مەزن بۆ لەناوبردنی خەلافەتی عوسمانی ، هێزەکانی هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانی یەکەم گەیشتبوونە ئەستەمبۆل و سورابونەوە بۆ ئەنادۆل ، واتە دەیانتوانی ئەستەمبۆل داگیر بکەن و سوڵتانیش بەدیل بگرن ، بەڵام بەپێی شارەزایانی بەریتانی و فەرەنسی ئەوکارە (واتە روخاندنی خەلافەت بەدەستی غەیرەدین) زیاتر هەست و نەستی موسڵمانانی جیهان قولتر دەکاتەوە بۆ زیندو کردنەوەی سیستەمی خەلافەت وەك چەند جاری پێشوو رویدابوو ، بۆیە ئەو شارەزایانە پێیان وابوو خەلافەت بەیەکجاری لەنێو دەچێ ئەگەر بەدەستی کۆمەڵێك بن کە بە ناو موسڵمان بن ، ئەوە بوو رۆڵی ئەتاتورك ، هەر بۆیەش رۆژئاوا و لایەنەکانی رێکەوتننامەی سیڤەر زەمینە سازییان بۆکرد ، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی رێکەوتننامەی نوێ مۆربکەن لەگەڵ تورکیا ، لەدوای دەسەڵات گرتنە دەستی محافزین[٣٤] لە بەریتانیا هەڵویستیان گۆڕا و لە ١٩٢٢/١٠/١١ بەریتانیا و ئەتاتورك رێکەوتنێکی تری مەیدانییان مۆرکرد ، لە ١٩٢١/٣/١٢ کۆنگرەی لەندەن کراو لەلایەن بەریتانیا (کیرزن) و لەلای تورکیا (بکر سامی) تەواو پاشگەزی لە سیڤەر و مافی کورد کرا ، ئەوەی جێبەجێ کرا تێپەر بوو بوو ئەو هەموو مەرجەی کە خرابووە سەر تورکیا لە قەرەبۆو قەدەغەکردنی چەك و قەبارەی هێزی عەسکەری وئیمتیازاتی کۆمپانیاکان و زۆر کاری گەورەتر چاوی لێ خشێنرایەوە بۆ ئەتاتورك ، ئەویش لەلای خۆی بەرەبەرە هەنگاوی لەدژی خەلافەت دەناو بەوشێوەیەی خوارەوە لە نێوان ١٩٢٠ هەتا ١٩٣٢ ئەو کارانەی کرد.

---

[٣٤] لەمانگی ترشینی ١٩٢٢ محافزین هاتنە سەر حوکم رایان بەرامبەر کێشەی کورد و سیڤەر بەسەلبی گۆڕا و چەرچل لە وەزارەتی موستەعمەرات نەما کە زۆر لایەنگیری لە سیڤەر دەکرد.

١- لە ١٩٢٠/٧/١ یاسای جینائی هێنایە جێی سنورە شەرعیەکان.

٢- لە ١٩٢٢/١١/١ سەڵتەنیەتی هەڵوەشاندەوە و سوڵتان محەمەد واحدالدین دەرکرا.

٣- لە ١٩٢٢ پایتەخت لە ئەستەمبۆل گواستەوە بۆ ئەنقەرە.

٤- لە ١٩٢٣/١٠/٢٩ خەلافەتی وەرچەرخاندە سەر کۆماری و ئەتاتورکیش بووە سەرکۆمار.

٥- لە ١٩٢٤/٣/٣ خەلافەت هەڵوەشێنرایەوە.

٦-لە١٩٢٤/٤/٢٨دادگا شەرعیەکانی هەڵوەشاندەوە.

٧- لە ١٩٢٤/١٠/٤ یاسای مەدەنی سویسری بەسەر تورکیا پیادەکرد.

٨- لە ١٩٢٨/٤/١٠ بەیەکجاری ئەو ماددەیەی دەڵێ (ئایینی فەرمی دەوڵەت ئیسلامە) لە دەستوری تورکیا (ئەنایاسا) لادرا.

٩- لە ١٩٢٨/١١/١١ پیتە ئیسلامیەکان ، یان یاسا یانەتر بڵێین پیتە عوسمانیەکانی گۆڕی بۆ پیتی لاتینی .

هەموو ئەوانە هەنگاو و زەمینە سازی بوو بۆ گۆڕینی سیڤەر بۆ لۆزان ، داوەتنامە هات بۆ بەشداری کۆنگرەی لۆزان ، دوو جۆرە نوێنەر خۆی ئامادە کرد ، یەکیان نوێنەری سوڵتان ئەوی تر عیسمەت ئینینۆی نوێنەری ئەتاتورك ، نوێنەری سوڵتان دەرکرا ، کۆنگرەی لۆزان بە ئامادەبوونی (بەریتانیا و فرنسا و ئیتالیا و یابان و یۆنان و رۆمانیا و سیرب و کرواتیا و سلۆڤینیا) لەلایەك و لەلای تورکیاش عیسمەت ئینینۆ بەشداربوو (٦) مانگی خایاند ، تا گەیشتە رێکەوتننامەیەکی ١٤٣ ماددەیی تیایدا کۆمەڵێك خاك و ئاوی تورکیا دۆڕاو ویلایەتی موسڵیش کەوتە سەر عێراق لە بەرامبەریشدا کۆمەڵێك مادەی سیڤەر بووە قوربانی ، لەنێویاندا هەر (٣) ماددەی ٦٢، ٦٣، ٦٤ . لەو رێکەوتننامەیە ١٢٨ جار ناوی تورکیا تیاهاتبوو ، ٢ جاریش ناوی عێراق تەنانەت بە وشەیەکیش ناوی کورد و کوردستانی تیادا نەهاتبوو[٣٥] .

[٣٥] لە هەندێ سەرچاوەی وەك د.محمد شمزینی لە کتێبی (جولانەوەی رزگاری نیشتمانی) محمد شێرزاد لەکتێبی (نضال الاکراد)، سەلام ناوخۆش لە کتێبی (احتلال وتقسیم کوردستان)، د.قاسملو و چەندین کتێبی تر ئاماژەیان بە ماددەکانی (٣٨، ٣٩، ٤٠)ی لۆزان کردووە گوایە مافو ناوی کوردی تیاهاتووە، دوای ئەوەی بەوردی بەراوردمان کرد لەگەڵ دەقی رێکەوتننامەی لۆزان بە ئینگلیزیەکەی دەرکەوت ناوی کوردی تیا نەهاتوە. بەڵام لە کتێبی (الحرکة الکردیة في العصر الحدیث- لازاریف وحلیلي -

# سەرەتای ستراتیژێکی لەنگ
# رۆڵی کورد لەو وەرچەرخانە

دوای ئــەوەی ئــەزموونی (دەوڵــەتی هاوچــەرخ) بــە نــاز نــاوی (ئــەڵمانیای لاو) ، (ئیتاڵیــای لاو) ، (بــەریتانیای لاو)... هاتــە نێــو عوسمــانی ، لــەوێش بزوتنــەوەی (عوسمانی لاو) لەساڵی ١٨٦٥ سەری هەڵدا ، دوایی بوە تورکیـای لاو بـە سـەرۆکایەتی مدحت پاشا ، دوایی لەساڵی ١٨٨٩ بەبۆنەی یادی ١٠٠ ساڵەی شۆڕشی فەڕەنسی بـوو بە ئیتحادوالترقی.. مەبەست لەو بزوتنەوە (لاو) انە دروسـتکردنی دەوڵـەتێکی عـەلمانی مۆدێرن بوو لەسەر ترازی ئەوروپیەکان ، تـا لـە سـاڵی ١٩٠٨ ئیتحادیـەکان ئینقلابیـان کـرد و لــە ١٩١٤/١٠/٢٩ش دوای ئـەڵمانیا کـەوتن و چـوونە نێـو جـەنگی جیهـانی و شکستیان هێناو وڵاتی عوسمانی داگیر و دابەشکرا ، لە ماوەی عوسمانی لەگەڵ هەوراز و نشێو و سەلبی و ئیجابیشدا بەڵام بارودۆخی سیاسی کـورد لـە میللـەتانی تـر چـاکتر بوو ، خاوەنی سەربەخۆیی خۆی بوو لەمیانەی ٦٠٠ ساڵ حـوکمی عوسمـانی سـەرجەم پـەلاماریان بـۆ بەشـەکانی کوردسـتان ناگاتـە (١٠) جـار ، باقیەکـەی تـر سـەروەری و سەربەخۆی بـووە ، بۆیـە بەشـداری کردنـی کـورد لـە ئۆپۆزسـیۆنی عوسمـانی بـەناوی ئیتحـادوالترقی و عوسمـانی لاو ئەوەنـدە جێـی شـانازی نـەبوو ، لـە دامەزرێنـەرەکانی ئیتحاد والترقی چوارکەس بوون:

١- د.عبدالله جودت. ٢- د ئیسحاق سکوتلی. ٣- محمـد رشـید چـەرکەس. ٤- محمد تەمۆ. دووەکەی یەکەم کورد بون ، ئەوەی یەکەم کەس بوو بیری تۆرانی هێنایە نێو تورکیا شاعیرێکی کورد بوو بەناوی (زیا ئەلب کۆك) ، ئەوەی یەکەم کەسیش بیری پیتی لاتینی هێنا هـەر کـورد بـوو بـەناوی (د.عبـدالله جـودت ) ، کۆمـەڵێك نـاوی تـری کوردی سـەر بـەو ڕەوشـەمان لـە پـێش تـر بـاس کـرد ، گرتنـە بـەری ئـەو سـتراتیژیە سەقەتە بـەردەوام بـوو لەگـەڵ مـستەفا ئـەتاتورکیش ، لـەوەوپێش باسـی هەڵوێـستی

ص١١٧) ، ماددەکانی ٣٨، ٣٩ یان وەك خۆی گواستۆتەوە بێ ناوی کورد.

هـەردوو دەسـەڵاتی عـەلمانی ناسـیۆنالیزمی ئەنقـەرە و دەسـەڵاتی نیمـچە ئیـسلامی ئەستەمبۆلمان کرد ، سەبارەت بە دەوڵەتی کوردستانی گەورە ئەو ستراتیژیە سـەقەتە وایکرد بەشێکی زۆر لە کوردەکان لایـەنگیری ئـەتاتورك و ئەنقـەرە بکـەن ، هـەروەك ( تۆماس بوا) لە کتێبی (تاریخ الاکراد) دەڵی : ئەگـەر کوردەکـان یارمـەتی ئـەتاتورکیان نەدابوایە سەرکەوتوو نەدەبوو ، ئـەتاتورك دوو کۆنگرەی خـۆ دروسـتکردنی ئەنجامـدا لـەژێر پارێزگـاری دەسـەڵاتی عەشـایەرە کوردەکـان ، یەکـەمیان لـە ئـەرزەرۆم لـە ١٩١٩/٧/٢٣ و دووەمیان لە ٤–١١/٩/١٩١٩ لە سیواس ، تـوانی عەلمانیـە کوردەکـان هەڵخەڵەتێنێ هەرچەندە بەشێکیش دڵسۆزبوون ، لە کۆنگرەی سیواس (خالدبـەگ) بـە (حـسن خـیری) گـ وت چـەندە دەڕوانمـە ئـەو هاوپەیمانـەمان لەگـەڵ ئـەتاتورك ئـەوا تیژکردنی تیغە بۆ ملی خۆمان ، چونکە لەلای ئەسـتەمبۆل سـەربەخۆی تـەواو دراوە و بوەتە رێکەوتننامەی دوەلی لە سیڤەر ، ئیتر ئێمە بۆچی ئەو حـازرە بەقـەرز و گفتێکـی زارەکی کەمال ئەتاتورك بگۆڕینەوە ، واپێدەچێ ئەوکاتە هەموویان ئاگایان لەوە نەبێ کە لە ماددەی (١)ی (میساقی نیشتمانی تورکیا)[٣٦] نکوڵی لەمافی کورد کرابوو ، ئینجا هـەر ئیحسان نـوری پاشـا لـە ل٢٠ی کتێبەکـەی خـۆی (شۆرشـی نەتـەوەیی کـورد لـە تورکیـا) دەڵێ تورکـەکان لـە کـاتی لێـدانی ئەرمەنـەکان دەیـان گـووت بـا لـە (زۆ – ئەرمەن)تەواو بین نۆرەی (لـۆ – کـورد) دێـت ، بـەهۆی ئـەو دوودڵیـە و گومانانـە بـوو سەرۆك عەشـیرەتەکان کۆبونـەوە و بـە نـاوی (هاوپـەیمانی هۆزەکـان)[*] نامەیـەکی (٥) پرسیاریان بۆ ئـەتاتورك نووسـی لـە ١٩١٧/١١/١٥ تیایـدا داوایـان کردبـوو بۆیـان ڕوون بکاتەوە ئاخۆ ئەویش وەك سولتان ئامادەیە بەتەواوی دان بە سەر بەخۆیی کوردستان بنێت[٣٧] ؟

بـەکورتی لەگـەڵ سـەرهەڵدانی بـیری نەتـەوەیی و هـاتنی دەوڵـەتی هاوچـەرخ بـۆ ناوچەکە دوو پرۆژە کەوتە کار لەنێو کورد:

[٣٦] ئەو میساقە لە ٢٨/١/١٩٢٠ دەرچوو ٦ماددەی سەرەکی بوو.

[*] پەیمانی عەشیرەتەکان ئەوەبوو:ئەگەر سێویان کەرت بکردبایە وهەریەکە پارچەکی بخواردبایە ئەوە پەیمان بوو .

[٣٧] هەر (٥) پرسیار لە کتێبەکانی :کوردستان من بدایە الحرب العالمیە الاولی الی نهایە مشکلە الموصل ص٢٠٩ ،هەروەها لە کتێبی جلیلی جەلیل و لازاریف وبەیتار نوری دەرسیمی وزۆر سەرچاوەی تر هەیە .

**یەکەمیان:** عەلمانیە کوردەکان بوو ، پێیان وابوو لەرێی عەلمانیەتی جیهانی و تورکی مافی کورد دێتەدی و هاریکارییان کرد لەگەڵ ئیتحادوالترقی و کەمالیزم و دوایی شکستی هێنا و کورد کەوتە مەینەتی.

**دوەمیان:** لایەنە ئایینیەکان بوون ، ئەوان پێیان وابوو لەرێی ئەستەمبۆل و دەوڵەتی عوسمانی مافی کورد دێتە دی ، لەسەرەتا ئۆتۆنۆمی وکۆنفدرالی دوایش سەربەخۆیی ، بەدرەنگەوە رێکخراو و کورد پەروەرەکانی تریش هاتنە سەر ئەو رایە ، لە ٢٣/٤/ ١٩٢٠شەریف پاشا بروسکەی رێزی بۆ سولْتان لێدا لە بەرامبەر هەلْوێستی چاکی بەرامبەر کورد ، هەروەها لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانی یاداشتێکی (یانەی ناوەندی کوردستان) تێدایە لە بەرواری ٢٠/ مارت/ ١٩٢٠ داوای سەربەخۆیی تەواوی کوردستان دەکا و نارەزایش دەردەبرِن دژ بە فراوان کردنی سنوری ئەرمەن لە سەر حیسابی کورد[٣٨]، بەو شێوەیە هاتۆنەتە سەر رای شێخ عبدالقادر شمزینی و ئاینیەکان بۆ قۆناغەکانی سەربەخۆیی کوردستان لەگەڵ عوسمانی.

بۆیە لەنێو کوردیش بەوهۆیەوە بوونە دوو بەش هەریەکە لە شێخ عبدالقادر شمزینی و شریف پاشا و شێخ سەعید پیران و نەورەسی و هەندێ لە بەدرخانیەکان و هەندێ دەستەی تری کوردی و ئایینیەکان[٣٩] پێیان وابوو ئەوەی مستەفا ئەتاتورك دە یکا فرِوفێڵ و تاکتیکە و دەستکەوتەکانی کورد لە ئەستەمبۆل و پەیماننامەی سیڤەر هەڵدەوەشێنێتەوە[٤٠] ، بەشەکەی تر وەك لە بەلگەنامەی بریتانی لەلایەن جێگری

---

[٣٨] برِوانە: کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیا- د.کمار مەزهەر ل٨٢

[٣٩] دیڤید ماکدۆنال ناوی لەوانە نابوو کوردی ئەستەمبۆلی.

[٤٠] بۆ وورد تر برِوانە ئەو بەلگەنامەیەی بریتانی چۆن عبدالقادر شمزینی ئامۆژگاری ئەفەندی وسەرۆك عەشیرەتەکان دەکا کە دوای ئەتاتورك نەکەون

مذكرة حول السيد عبدالقادر الشمزيني وسمكو

من المندوب السامي البريطاني / القسطنطينية (٢٠ مايس ١٩٢٢)

......

وأشتكى السيد عبدالقادر بأن كل المناشدات التي قدمها للحكومة صاحب الجلالة لم تلق آذاناً صاغية و أنه فشل في كسب ثقة جلالته. وكرّر، كما فعل ذلك عدة مرات، بأنه كان في موقع يساعده على السيطرة على الكرد في الولايات الشمالية الشرقية، لو أعطيت له الفرصة للتحرك. وأكد هذه المرة وبثقة على قدرته بإقناع سمكو للعمل وفق مصالحنا وأضاف أنه لا طائل من الاعتماد على أشخاص مثل مصطفى باشا وآخرين الذين يحومون هنا وهناك. هؤلاء ليس لهم تأثير حقيقي على الكرد.

مەندوبی سامی بریتانی لە١٨/ مایس/ ١٩٢٠ ناردوە و دەڵێ (ناحەزانی سەید عبدالقادر بریتین لە دەستەیەکی زۆر لەیەك نەچوو هی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نیە ، زیاتر لەگەل ئەتاتورك ڕۆیشتون ) [41][42] ، بەو شێوەیە پیاوانی کوردی وەك : حسن خەیری ، برنجی زادە ، زولفی بەگزادە ..هەڵخەڵەتان و بەشێکی تری وەك :عیسمەت ئینینۆ ، زیاکۆك ئەلب ، علی سائیب ،...زۆری تری کورد کەوتنە خزمەتی تۆرانیەت ، لە ڕاستیدا سەرچاوەی جیاوازیەکانیان لەوەوە دێت **ئاینیەکان بانگێشەی برایەتی تورك و کوردیان لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی دەکرد** ، **هەرچی ئەو بەشە عەلمانیە کوردە بوو بانگێشەی برایەتی کورد و تورکیان لە چوارچێوەی دەولەتی مۆدێرنی تورکیا بە سەرکردایەتی ئەتاتورك دەکرد**[43] ، بۆیە ئەوانە زۆر لایەنگیری سیڤەر و پڕۆژەی دەولەتی کوردیان نەکردوە ، زیاتر ئاینیەکان بە نەخشە و پلان بوون بۆ ئەو مەبەستە ، سمکۆش لەلای خۆیەوە بە پشت بەستن بە سیڤەر حکومەتێکی دروستکرد لەساڵی ١٩٢٢ ، بەڵام عەلمانی و عەشایرە کوردەکان لاگیری ئەتاتورکیان کرد و هەتا لە کوردستانی خوراووش ئەو دووبەرەکیە روویدا ، لەکاتێکدا شێخ محمود و زانایانی ئایینی پێیان وابوو لەرێی ئەستەمبۆل و سوڵتانەوە مافی میللەتی کورد زامن کراوە و بوەتە بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی و عەلی ئیحسان پاشا بەناوی سوڵتانی عوسمانی لە ١٩١٨/١٠/٣ بروسکەی دان پێهێنانی بۆ حکومەتی شێخ مەحمود کردوە و وەك (مەلیك) ناساندویەتی ، کەچی لایەنە عەلمانیەکەی نێو حکومەتی شێخ مەحمود لەوانەش رەفیق حیلمی لاگیری ئەتاتورکی کرد و هەرخۆی لە (یاداشتەکانی) دەڵێ شێخ مەحمود لە پاداشی ئەو چاکەیەی سوڵتان بۆ کورد فەروەیەکی بەدیاری پێدا ناردم بۆ سوڵتان لە ئەستەمبۆل ، کەچی ئەو چوو بۆ ئەنقەرە و دایە ئەتاتورك و تاقمەکەی و زەماوەندی مەی خواردنەوەیان کردوە لەگەل

---

[41] دەقی ئەو بەلگەنامەی لە پێشوتر لەئیجابیەکانی سیڤەر بلاوکرایتەوە .

[42] بڕوانە: بەلگەنامەی بریتانی ژ: ٦٢٠/م -١٧٤٢ لە ل٧٧ی کتێبی کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی حکومەتی بریتانیادا بلاو کرایتەوە .

[43] بۆ تێگەیشتن زیاتر بە ووردی مێژووی دعبداللە جودت بخوێنەوە لەکتێبی: (القومیە الکردیە ود عبدالله جودت ) خۆی بە نازناوی کوردی- تورکی ناوزەد کردووە .

کەمالیەکان[٤٤]، بەو شێوەیە دەنگی عەشایەری و لایەنە عەلمانیەکان زاڵتر بوو ، لەگەڵ مستەفا کەمال کەوتن ، لەوەش زیاتر خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا بەو پیاوە هەڵخەڵەتا بوون و یارمەتییان بۆ ئەتاتورك کۆ دەکردەوە ، بەپێی بەڵگەنامەی بەریتانی ژ:٢١ لە ١٩٢٩/٤/١٨ بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نوسراوە دەڵێ: مانگانە یارمەتی٦٠,٠٠٠$ یان بۆ ئەتاتورك دەنارد تا بزوتنەوەی خۆیبوون تێیانیگەیاند کە ئەتاتورك چیە و یارمەتیەکەی پێ وەستاندن ، تەنانەت ئیحسان پاشاش کە لەدواییدا لە ١٩٢٧بە شۆڕشی ئاگریداغ هەڵسا ، لایەنگیری ئەتاتورکی کرد و ئەفسەری بەرپرس بوو لە سەربازگەی ئەستەمبۆل و تەسلیمی ئەتاتورکی کرد لە دژی سوڵتان[٤٥]، بەو شێوەیە کوردە رۆشنبیر و لائیك ( عەلمانی ) و سەرۆك عەشیرەتەکان بەشداریی و پشت گیریان لە دام و دەزگا و حکومەت و پەرلەمانی ئەتاتورك کرد لەژێر ناوی (برایەتی کورد و تورك لە دەوڵەتی تورکیای نوێ).

د.عبدالله جودت دەڵێ: "لە ئەنجومەنی تورکیا– پەرلەمان (بیویج مجلس)[٤٦] کورد ٧٢ ئەندامی هەبوو ، بە سەرۆکایەتی (حسن خیری– نوێنەری دەرسیم) ، هەر بەو رەوتەش ئەتاتورك توانی بەوانە بسەلمێنێ کە کورد جیابونەوەی لەگەڵ تورکی برای ناوێت و سیڤەری ناوێت و سوڵتان و ئەستەمبۆل و شێخ عبدالقادری شەمزینی و شێخ سەعیدی پیرانیان بە نەفام و رێزتێکدەری میللەتانی برا لە قەڵەم دا ، بەو شێوەیە مستەفا کەمال وەفدێکی رێکخست بۆ کۆنگرەی لۆزان کە پێکهاتبوو لە سەرۆکەکەی (عیسمەت ئینینۆ) و دوو کوردیش لەگەڵیدا بەناوی (عارف محمد برنجی زادە ، زولفی بەگزادە) ، ئەوانە بەناوی کورد چوون لەوێ وتیان ئێمە سیڤەر مان ناوێ لۆزانمان دەوێ ، لەنێو پەرلەمانی ئەنقەرەش حەسەن خەیری بە جلی کوردی دەوامی دەکرد و بە بێ تەل بەردەوام بروسکەی بۆ کۆنگرەی لۆزان لێدەدا و دەیوت ئێمە سیڤەرمان ناوێت و لۆزانمان دەوێت ، سوڵتان واحدالدین–مان ناوێ ، مستەفا کەمالمان دەوێ ، خەلافەتی عوسمانیمان ناوێ تورکیای نوێمان دەوێت ، شەریعەتمان ناوێ دەستورێکی عەلمانیمان دەوێت . لۆزان مۆر کرا بێ ئەوەی ناوی کوردی تێدا هەبێ .

---

[٤٤] رەفیق حلمی –یاداشت ل٩٧ ول١٢٥
[٤٥] بڕوانە: شۆڕشی ئاگری داغ- ئیحسان نوری پاشا- ل٢٢
[٤٦] ئەو ئەنجومەنە لە کۆنگرەی سیواس لەمانگی تشرینی ١٩٢٠ بناغەی دانرا.

بەم شێوەیە سیڤەر وەرچەرخا بۆ لۆزان ، کوردیش کەوتە مەینەتی و پارچە پارچە بوو ، ناوی لەسەر نەخشە و کۆنگرە نێودەوڵەتیەکان سڕایەوە ، لەولایەش کە ئەتاتورك تەواو لە سیڤەر و ئەستەمبۆل رزگاربوو ، دەستی کرد بە گرتن و لەسێدارەدانی سەرکردە کوردەکان و پێداهات بە دۆستەکانی و حەسەن خەیری و برنجی زادە و زولفی بەکزادەشی تیرباران کرد ، سەرۆکی دادگا ناوی (صائب پاشا) بوو ، توهمەکەش ئەوەبوو ئەوانە بە پێشێلکاری یاسای (جوداخوازی) جلوبەرگی کوردییان لەبەرکردووە ، وەسیەتێکی خەمناکی ئەوانە تۆمارکراوە لەلایەن خەڵکی ناوچەکە بۆ نەوەکانیان دەگێڕنەوەو[٤٧] دەڵێن هەرسێکیان لەکاتی لەسێدارەدان وتیان: ئێمە هەڵەی گەورەما ن بەرامبەر کورد کرد ، ئێمە هۆیەك بووین لە شکستی کورد ، بۆیە گۆڕێکمان لەسەر رێی دیاربەکر بۆ لێبدەن ، لەسەر کێلی گۆڕەکەمان بنوسن: هەر کوردێك بێرەدا رەت بوو بەردێکمان تێبگرێت..چونکە ئێمە خیانەتمان بە کورد و زانایانی ئاینی کرد ، بەو شێوەیە لۆزان هاتەدی و ئینجا سەرکردە ئاینییەکان هەڵسانەوە و دەستیان بە شۆڕش کرد و یەکەم شۆڕش لە دژی لۆزان و ئەتاتورك بۆ گێڕانەوەی سیڤەر و سوڵتان کرا لەلایەن شێخ سەعیدی پیران بوو لە ساڵی١٩٢٥ خەریك بوو سەرکەوی بەلاَم دوایی شکستی هێنا . لەلای عیراقیش برسی کۆکس بە نوسراوێکی فەرمی ژ: ٤\٣٣٣٠ لە١٩٢١/٢/٢٢ داوای لە حکومەتی عیراقی دروست کراو کرد تا کوردستان بخەنە سەر عیراق[٤٨] .

[٤٧] هەروەها د جبار قادر لە مێزگردێکی تەلەفزیۆنی میدیا باسی ئەو بەسەرهاتەی کرد .
[٤٨] بڕوانە : تاريخ الوزارات ص٣٤

# هۆیەکانی جێبەجێ نەبوونی ماددەکانی ( ٦٢-٦٤ )

وەك لەوەوپێش باسمانکرد بەشە هەرە گرنگەکانی سیڤەر جێبەجێ کرا ، بەڵام ئەگەر بەوردتر سەیر بکەین دەبینین جێبەجێ کردنەکەی بەیاسایی نەبوە ، بەڵکو بەپێی دیفاکتۆ و هێزی عەسکەری بووە ، ئەوەی لەژێر کۆنترۆڵی تورکیا بوو پەیڕەو نەکرا ، ئەوەی بەدەریش بوو پەیرەو کران، ماددەکانی٦٦-٨٣ سەبارەت بە سمیرنا کاڵ بۆوە لەگەڵ سەرکەوتنەکانی ئەتاتورك ، لەگەڵ دروستبوونی سەرهەڵدانی تورکیای نوێ مادەکانی سەبارەت بە خودی تورکیا و قەبارەی سوپا و چەك و قەرەبۆش... کاڵ بۆوە لەگەڵ شکستی کورد ، مادەکانی سەبارەت بە ئەرمەنیش (٨٩-٩٣) جێبەجێ نەکرا ، کەچی لە ماددەی (٩٥) بە ئاماژەیەکی لابەلا و سادە بە بەڵێنی بەلفۆر کراو لە سالی ١٩٤٨ئیسرائیلی پێ دروست بوو ، دەبینین ٣ مادەی زەقی سیڤەر بۆ کوردستان نەبوە کەم ترین ماف ، لەو بارەیەوە کۆمەلێك هۆکار باس کراوە لەلایەن بریتانیا ، یەکێکیان هەڵدەبژێرین کەلەگەل ڕەوتی بابەتەکەمان گونجاوە ، (دی رۆبیك) لە بروسکەیەکی دا بۆ کیرزۆن ویەکێکی تریش بۆ ویلسون دەڵێ :( ئەو چالاکیانەی شریف پاشا دەیکا تەنها بەناوی خۆیەتی نوێنەری کەس ناکا ، چ لەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ ئەرمەنیەکان چ لە کۆنگرەکانی نێو دەولەتی) ، هەلبەتە زۆر ڕوونە لەهەموو بەشەکانی کوردستان بروسکە نێردرا کە شریف پاشا نوێنەرە ، بەشێك لە مێژوونوسی کوردیش دەلێن سەرکردە ئاینیەکان شریف پاشایان بە نوێنەری خۆیان نەناسیوە ، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە یەکەم جار لەلای ئەوان هەڵبژێردرا ، شریف پاشا زاوای سەرۆك وەزیرانی عوسمانی (سەدرل ئەلئەعزەم ) سعید حلیم پاشا و نەوەی محمد علی پاشای میسر بوو ، (زنار سلۆپی) دەلێت: یەکەم جارکۆمەلەی ژیانەوەی کورد شریف پاشای بە نوێنەر دەست نیشان کرد کە شیخ سعیدی نەورەسی* دامەزرێنەری بوو [٤٩]،شیخ عبدالقادریش هەم لایەنگری لە ڕێکەوتنەکەی شریف پاشا و ئەرمەن کرد و هەم بەتایبەت وەڵامی بەنوسراو بۆ (دی رۆبیك) نارد کە نوێنەری شەرعی کورد شریف

[٤٩] بڕوانە قضایا القومیات واثرهاعلی العلاقات الدولیة ص٩٢

پاشایە[٥٠]، لەنامەیەکی تردا کەلەبەڵگەنامەی بریتانی دۆزراوەتەوە لەلایەن (نشینگەی کۆمیسێری باڵای نهێنی-أ-) لە ١٩٢٤/١٢/٤ بۆ سکرتێری موستەعمەراتی ناردووە ناوی کۆمەلێك لەسەرکردە دیارەکانی ئاینی و لائیکی کوردی ناوچە جیاجیاکانی تیایە بۆ بەنوێنەر کردنی شریف پاشا[٥١]، بەو شێوەیەش سمکۆ و شیخ محمود و سەرکردەکانی تریش ، کەواتە بریتانیا لە هەنجەت گەڕاوە ، با بزانین هۆیە ڕاستەقینەکانی جێبەجێ نەبوونی سیڤەر چی بوو:

١- سەرکەوتنی ئەتاتورك وئەنقەرە و مدرسەی عەلمانی بەسەر سولتان و ئەستەمبۆل ومدرسەی ئیسلامی .

٢- سەرکەوتنەکانی ئەتاتورك لە هەردوو بەرەی جەنگی رۆژئاواو خوارو.

٣- گۆڕانی حکومەتی بەریتانیا (چەرچل) بە محافزین ، ئەتاتۆرك بە سولتان ، لە ئیتالیا و فرنساش گۆڕان بوو .. هەموو ئەوانە لە قازانجی پێشهاتەکانی نوێی تورکیا بوو .

٤- رێکەوتنەکانی ئەتاتورك لەگەڵ روسیا و فەڕەنسا و بەریتانیا و ئەڵمانیا.

٥- نەگەیشتنی هێزەکانی هاوپەیمانان بۆتەواوی کوردستان.

٦- بەشێکیش دەکەوێتە ئەستۆی کورد خۆی و بەشێکیش لە ئەستۆی ساغ نەبونەوەی مادەکانی سیڤەرە.

٧- چاوتیبرینی بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ و سازشکردن لەسەری.

٨- ئەمریکاو باقی وولاٽانی تر زۆر سور نەبوون لە سەر جێ بە جێ کردنی سیڤەر و دەیان گوت هەمووی لە قازانجی بەریتانی داڕێژراوە ، تەنانەت ئەمریکا لە ١٤ بنەماکەی (ویلسۆن) یش پەشێمان بۆوە سەبارەت بە مافی چارەنووسی میللەتان ، هەروەها فرنسا و بریتانیاش لە لێدوانە هاوبەشە بەناوبانگەکەی رۆژی١٩١٨/١٠/٧ سەبارەت بە مافی چارەنووس پەشێمان بوونەوە ، فرنسا یەکەم وولاٽ بوو هەیبەتی سیڤەری شکاند و دانی بە تورکیای نوێ هێنا ، دوای ئەو ئیتالیا بوو ، روسیای بەلشەفیش پشتی ئەتاتورکی گرت و یەکەم کۆبونەوەیان لە١٩١٩/٦/٢١ لە نێوان

---

[٥٠] بڕوانە : سیاسة البریطانیة العظمی تجاه مستقبل کردستان ص١٩٨-١٩٩

[٥١] دەقی نامەکە لە بەلگەنامەی ژ:٤٧ ی کتێبی کۆمەلەو ڕێکخراوە کوردیەکان لە بەلگەنامەکانی بریتانی وفرنسی ل١٦٦- بخوێنەوە .

ئەتاتورك وسیمن بودێنی گرێدرا بۆ یارمەتی سەربازی تورکیا ، ئەمریکاش لەدژی ئەو هەنگاوانەی بریتانی وەستا و داوای (سیاسە الباب المفتوح)کرد و لیژنەی (کنگ-کراینی) بۆ ناوچەکە دروست کرد و داوای کرد هەموو ئەو ناوچانەی لە عوسمانی جیاکراوە بخرێتە سەر مومتەلەکاتی (عصبە الامم) ، بەو شێوەیە لەسەر یەك ڕەئی نەبوون و هێزی جێ بەجێ کردنی سیڤەریان لاواز کرد.

## کاریگەری یاسایی و سیاسی سیڤەر بەسەر دۆخی ئێستای کورد ئایا سیڤەر لەرووی یاساییەوە هەڵوەشاوەتەوە؟

هنری بوانکاریەی سەرۆکی فرنسی ئەوسا وەسفی سیڤەری کرد و گووتبووی سیڤەریش شکا وەك شکانی ئەو کاشی و فەخفوریانەی لە شاری سیڤەر دروست دەکرێ * ، ئایا دەکرێ بە لێدوانێکی وا سادە وابزانین کۆتایی بە سیڤەر هات ؟

لەبەر ئەوەی لەو بابەتە نەکۆلراوەتەوە وا پێویست دەکا بناغەیەکی لۆجیکی و ئەکادیمی بۆ دابڕێژرێت ، با بزانین ئەو پاساوە یاساییانەی دەتوانین بیکەینە بناغە بۆ ئەوەی بتوانین بڵێین سیڤەر هەڵنەوەشاوەتەوە چین ، لەبەرامبەر پاساوەکانی هەڵوەشاوەیی چیە ، لەوە وەش پێویست بەوە دەکا بشزانین ئاخۆ رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی چۆن دروست دەبێ و چۆن هەڵدەوەشێتەوە ، رەنگە لەسەرەتاوە وەڵامی ئەوەمان دابێتەوە کە سیڤەر چۆن گرێدرا ، ماوە بزانین پاساوی هەردوولا چیە ، ئاخۆ ئەگەر پارێزەرێکی نێودەوڵەتی بۆ کورد تەرخانکرا لەو کێشەیە بپێچێتەوە ، وەلا م و پاساوی تورکیا و عێراق و سوریا چ دەبێ (بەتایبەتی تورکیا) ، چۆن کورد دەتوانێ هەندێ هاوبەشی نێودەوڵەتی بۆ خۆی پەیدا بکا لەو کێشە یاساییە؟ بۆ نمونە ئەرمینیاش بەشی لە ئەنادۆل پی درا ، یان (ئەزمیر) بۆ یۆنان ، ئاخۆ دەتوانین پارێزەرێکی هاوبەش بگرین تا دۆزەکە بگاتە ئاستی نێو دەولەتی ، یان هەر خۆمان پارێزەرێکی بۆ بگرین بەلگەی یاسایی چی پێ بدەین ؟

أ/- ئەوانەی دەڵێن سیڤەر هەڵوەشاوەتەوە ، پاساوەکانیان ئەوانەی خوارەوەیە:

* شاری سیڤەر لە فرنسایەو ئەو کات بە دروست کردنی ئەو جۆرە کەل وپەلانە بەناو بانگ بوو .

١- رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی هەڵدەوەشێتەوە ئەگەر شەخسیەتی یاسایی لەدەستدا و ئەوە بوو عوسمانی لەنێوچوو ، بۆیە سیڤەریش لەگەلیدا هەڵوەشایەوە.

٢- ئەو رێکەوتنامەیە هەر لە بنەچەدا یاسایی نەبوو چونکە لەنێوان لایەنی سەرکەوتوو لایەنی ژێر کەوتوو بوو.

٣- لە دوایدا رێکەوتنێکی تر لە لۆزان کرا سیڤەری هەڵوەشاندەوە.

٤- هەر خۆی رێکەوتننامە ی نێودەوڵەتی ئەگەر ماوەیەك بەسەرچوو ئیشی پێ نەکرا ئیکس پایەر دەبێ و بە هەڵوەشاوە حسابە.

٥- ئەنجومەنی مەزنی (پەرلەمان) و میساقی نیشتمانی تورکی تەسدیقی نەکرد.

٦- کورد داوای جیابونەوەیان نەکرد لەگەڵ تورکیای نوێ.

٧- ئەوەی هەڵی وەشاندوەتەوە (تورکیای نوێ) ئەوا وڵاتێکی فەرمیە و ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

٨- لە کۆنفرانسی لەندەن( ٢١/٢-١٢/٣/ ١٩٢١) بە ئامادەبوونی بەریتانیا لایەنی تورکیا داوای کرد مادەکانی سەبارەت بە کوردستان هەموار بکرێت ، ئەوەش نیشانەی ئەوەیە پێی قایل نەبووە .

٩-ناوی کوردستان لە لیستی ئینتدابەکان نەهات .

١٠-هەموو ولاتانی هاوپەیمانان پە شێمان بوونەوە بەدیلی تریان پێشنیار کرد لە سەرووی هەموان ئەمریکا .

ب/- ئەوانەی دەڵێن هەڵنەوەشاوەتەوە ، یاخود دروستتر ئەوە پێویستە پارێزەرە یاساییەکەی کورد چی بڵێ و پاساوی چی هەیە بۆ وەڵام ، دەکرێ ئەوانەی خوارەوە پاساوەکانی بێت:

١- پێناسی رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی رەگەزی (ئارزەوومەندانەی) تێدایە و لەوێش نوێنەری عوسمانی بە ئارەزووی خۆی دوای (٢) ساڵ لە تەواو بونی جەنگ هاتووە و مۆری کردووە ، واتە بە زۆر نەبووە ، ئەگەر بە زۆریش بێت هەر بەشێکە لە رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی مادام خودی نوێنەرەکە زۆری لێنەکراوە ، لەڕاستیدا رێکەوتنامەی فرسای ١٩١٩/٧/٢٨ لەگەل ئەلمانیا بە زۆر بوو ، بۆیە تا سیستەمی حوکم نەگۆڕا و لە ئیمپراتۆری بوە کۆماری ئینجا مۆرکرا .

٢– بەشی هەرەبنچینەی ئەو ڕێکەوتننامەیە جێبەجێ کراو وڵاتانی ناوچەکە لەسەر ئەو بنچینەیە دروستبووە ، تەنانەت تورکیای نوێش پابەند بوو بەو ڕێکەوتنە و مەرجەکانی قەبوڵ کرد و ڕوبەر و قەبارەی ئاوا مایەوە ، ئەگەر سیڤەر هەڵوەشابێتەوە یان هەر لە بنچینەدا یاسایی نەبێ ئەوا ئەو پرسیارە یاساییە دەکەوێتە سەر عێراق و سوریا و حیجاز و خودی تورکیاش... کە دەوڵەتی یاسایی نین تەنها دیفاکتۆن ، تەنانەت ئیسرائیل[٥٢] لە ١٩٤٨ و سودان و لیبیا لە ١٩٥٢ بەپاڵپشت بە سیڤەر سەربەخۆییان وەرگرت واتە ٣٢ سال دوای مۆرکردنی.

٣– تورکیای نوێش بەپێی پەیماننامەی (فرانکلین–بۆیۆن) دانی بە سیستەمی ئینتداب نا کە لە سیڤەر دروست بوو ، ئینجا تورکیا خۆی بە میراتگری عوسمانی هەژمار دەکا بۆیە داوای ویلایەتی موسڵی کردەوە ، ئەوەش کۆمەڵێك مافی یاسایی دەخاتە ئەستۆی و لەپێش هەموان جێبەجێ کردنی تەواوی مادەکانی سیڤەر بە مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) یشەوە.

٤– لەکێشەی ویلایەتی موسل پاساوەکانی بریتانی و تورکیش هەر گەڕانەوە و پالپشت بوو بۆ ئەو ڕێکەوتنامەیە .

٥– مادەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی سەبارەت بە کوردستان نەك هەر (بەزۆری بوو یان بەزۆری نەبوو) بەڵکو لەوپەڕی ئارەزوومەندانە بوو ، چونکە لەپێش سیڤەریش لە هەردوولای پەیماننامەکە ئەو بەندانەی تیا هاتبوو ، لەلای عوسمانی ئەو مادانە بە دوو قۆلی عوسمانی و کوردی مۆر کرابوو (هەروەك لە بەشی گرنگی سیڤەر باسمان کرد) ، لەلای هاوپەیمانیش: لە سەرەتای سەدەی ١٩ بەڵێنی وا هەیە[٥٣]، کۆنگرەی بەرلینی ١٨٧٨[*] ، کۆنگرەی پاریسی ١٩٠٢، کۆنگرەی سان ریمۆ ی ١٩٢٠، و لەپێش ئەویش لە کۆنگرەی ئاشتی لە ٣٠/ ١٩١٩/١ هاوپەیمانان و وولاتانی سەر بەوان ڕێکەوتن کە ئەرمینیا و کوردستان و میزۆپۆتۆمیا و فلستین ولاتانی عربیش لە عوسمانی جیا

---

[٥٢] لە ١٩٤٧/١١/٢٩بڕیاڕی ژ:١٨١ی خولی (٢)لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوو بۆدابەشی فلستین وبەرجەستەی ڕێکەوتنامەی سیڤەر .

[٥٣] بڕوانە کتێبەکانی محمدمحمد الصلابی .

[*] لایەنەکانی بەشداربووی کۆنگرە بریتی بوون لە : ئەلمانیا، بریتانیا، فرنسا، ئیتالیا،،روسیا، پروسیا، مەجەر ، عوسمانی .

بکرێتەوە ، لە سەر ئەو بنچینەیە شریف پاشا لە(١-٢١)/٣/١٩٢٠وەك نوینەری کورد دوو نەخشەی کوردستان پێش کەش بە کۆنگرەی ئاشتی کرد.

٦- ئەگەر (شەخسیەتی یاسایی) عوسمانی لەنێوچوو و تورکیای نوێش خۆی بە میراتگری عوسمانی نەزانی (هەرواشە) ئەوا چۆن دەتوانی لەجیاتی ئەو رێکەوتننامەی سیڤەر بە لۆزان بگۆڕێ ، واتە حوکمی یاسایی ماوە.

٧- دەوڵەتی عوسمانی تا ساڵی ١٩٢٤ مایەوە و هەڵی نەوەشاندەوە ، لەو ماوەیەش هەر رەزامەندی بۆ ئەو ڕێکەوتنە بەردەوام بووە و هیچ بەلگەیەك نیە پابەند نەبوونی خۆی ڕاگەیاندبێ .

٨- هیچ مادەیەك لە (لۆزان) ئاماژە بە هەڵوەشاندنەوەی سیڤەر ناکا بەلکو پالپشتی دەکاتە سەر ، ئەوەش بەلگەیە لە سەر قایلی تورکیا پێی .

٩- ئەوکاتە کە سیڤەر گرێدرا (پەرلەمان)ی تورکیا لەسەر زەوی لەدایك نەبوبو ، سیڤەر لە ١٠/ ٨/١٩٢٠ کرا ، کەچی پەرلەمانی تورکیا (بویج ماجلس) لە مانگی ٤/١٩٢٠ لە سیواس تەنها بڕیاری لەسەر درابوو ، تەنانەت حکومەتەکەی ئەنقەرەش دانی پیا نەهێنرابوو . ئینجا مەرج نیە پەسەند کردنی پەرلەمانی بوێ هەروەك سیستەمی فرنسی پێویستی بەوە نیە ، سەرەڕای هەموو ئەوانەش سیستەمی عوسمانی و دەستورەکەی ئەو دەسەڵاتەی بە سوڵتان و سەدری ئەعزەم دابوو.

١٠- باشترین بەڵگە بۆ ئەوەی بزانین خواست و رای گشتی کورد ئاخۆ جیابونەوە بوو لەگەڵ تورکیای نوێ یاخود نا ئەوا شۆڕش و راپەڕینەکان وەڵامە ، بەتایبەتی شۆڕشی ١٩٢٥ی شێخ سەعید ودوایش ئاگری ئیحسان پاشا ، ئەوەی لەگەڵ ئەتاتورك بوو هەندێ لائیکی کورد و هەندێ سەرۆك عەشیرەت بوون ، تەنانەت ئەگەر ئەوەش ببێتە بنچینە هەر ئیجابیە ، چونکە ئەتاتورك تورکیای نوێی بە (شراکە) دروستکرد لەنێوان کورد و تورك ، تورکیای نوێ لە کۆنگرەی سیواس بناغە ڕێژ کرا و یەکەم مادەی بریتی بوو لە دروست کردنی دەولەتی تورکیا بۆ هەردوو نەتەوەی تورك و کورد ، دوای (وەك رۆبەرت ئولسن) دەڵێ :لە ١٠/٢/١٩٢٢پەرلەمانی تورکیا بڕیاری سەربەخۆیی کوردستان لە ١٨ مادەدا گفتوگۆ کرد * ، کوا ئەو بەڵێنانە ئێستا زمانیشی

* وا پێدەچێ مادەکان ڕوون نەبن بۆیە لە کۆی ٧٢ پەرلەمانتاری کورد ٦٤ یان ناقایل بوون پێی دوا خرا .

لێ قەدەغە کردون ، ئەگەر بەهۆی لۆزان وبەڵێنەکانی تورك سیڤەر هەلوەشایەوە دەبا ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکرێ.

١١- تەنانەت مادەکانی (٣٨-٤٠)ی لۆزانیشی جێ بەجێ نەکرد کە تەئکید لە مادەکانی (١٤١ و١٤٥)ی سیڤەر دەکا و تیایدا هاتوە: جیاوازی نەکا لەسەر بنچینەی زمان و ڕەگەز و ئاین و..هتد.

١٢- هەر بەهۆی سیڤەر و هەڵوێستی عوسمانی بەرامبەر کورد لە (میساقی نیشتمانی) کە پێکهاتبوو لە ٦/ مادده، لە مادەی یەکەم دانیان نابوو بە ئەحکامی سیڤەر و سەربەخۆی میللەتی غەیرە تورك.

١٣- لە کۆنفرانسی لەندەن کە لە ٢/٢١ هەتا ٣/١٢)ی ١٩٢١ی خایاند ، بەریتانیا و هەردوو نوێنەری عوسمانی و کەمالی ئامادە بوون ، تەنها نوێنەری کەمالی داوای هەموار کردنی سیڤەری دەکرد ، بەڵام مۆرنەکرا لەلایەن نوێنەری عوسمانی ، ئەو کاتیش هەر عوسمانی فەرمی بوون نەك کەمالی ، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لەلایەن (عصبە الامم) نوێنەر دیاری بکرێ و بڕیارێکی یاسایشی لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٢ دەربکرێ و سەرنجی هێزەکانی هاوپەیمانانی راکێشا بۆ زامنکردنی مافی کورد کە لە سیفر هاتبوو.

١٤- سەبارەت بەوەی گوایە کوردستان ناوی لە لیستی ئینتداب نەهاتوە ، خۆ ئەرمینیاش ناوی لەو لیستە نەهاتبوو ، ئەوە مەرج نەبوو .

١٥-ئەمریکا پێشنیاری نەکرد هەتا ئەو ویلایەتانەی لە عوسمانی دابراون بدرێتەوە تورکیا بەلکو (وەك فۆرستر دەلێت)[٥٤] ئەمریکا پێشنیاری کرد بخرێتە سەر مومتەلەکاتی کۆمەلەی نەتەوەکان ، ئەوەش جێگەی رەزامەندی کوردە هەتا ئیستاش .

١٦-هەر خودی (کۆمەلەی نەتەوەکان) پالپشت بە سان ریمۆ و سیڤەر دروست بوو ، دیباجەکەی مادەی ٢٢ ی دیسان پشت بە سیڤەر دەبەستێ ، هەروەها لە دروست کردنی ئەو دەولەتانەی ئەوروپی و ئەفریقی و ئاسیای پشتی بە سیڤەر دەبەست بۆ بە یاسایی کردنی ، هەر بەنمونە لە دروستکردنی دەولەتی عێراق لەلایەن (عصبە الامم) پشتی بە هەردوو مادەی سیڤەر٩٤ و١٣٢ بەست .

[٥٤] بڕوانە : فۆرستر –نشأة العراق الحديث ص١٤٧-١٤٨

١٧-لەدوای جەنگی جهانی دوەم بۆ سەربە خۆیی پۆلۆنیا پەیماننامـە سـەبارەت پاراستنی کەمایەتی لە ١٩٤٥/٦/٢٨ بەسترا و پالپشت کرایە سەر مادەکانی ١٠ و١١ ی ڤرسای کە هاوتای ئەو مادانە لەسیڤەر لەمادەکانی ١٤٠ تا١٥٠ هاتبوون .

١٨- تەنانەت هاوپەیمانان کە لە جەنگی کوێت عیراقیان خستە بەندی حەوتـەمی (میساقی نەتەوە یـەکگرتوەکان)[٥٥] ئەمـەیان بـە پالپشتی ئـەوەلیاتی یاسـایی سیڤەر کرد.

١٩- زۆر بـاس لـە لـۆزان دەکـرێ ئـاخۆ سـیڤەری هەلوەشـاندۆتەوە یـاخود نـا ، پرسیاری یاسایی ئەوەیە ئاخۆ چەندە لۆزان شەرعی و یاساییە؟ ڕێسای بنـچینەیی بـۆ یاسای نێو دەولەتی سەبارەت بە ڕێکەوتنەکان ئەوەیـە : بـە پێـی مـادەی ١٠ ی (عهـد عـصبە الامـم) و ٤ ی هەرێمـەکان و مـادەی ٢ و٤ ی میـساقی نەتـەوە یـەکگرتوەکان و مادەی ٥٣ ی (قانون المعاهدات) نابێ ئەو ڕێکەوتنانە ببتە هـۆی بردنـەوەی هـەرێمێك بە هۆی بە کارهێنانی هێز لە پەیوەندی نێو دەولەتی . ئەوەی بەسەر کوردستان هـات چ لەخواروو چ لە سەروو هەمووی بە هۆیێ هێز بوو ئینجا لۆزانی بەسەر گرێدرا .

دوای ٨٩ سـالٚ بەسـەر چـوونی ئـەو ڕێکەوتننامەیـە ، وەك هـەموو لایـەك دەزانـین کـە لەرووی سیاسیەوە ئەو بەشەی بۆ کـورد و ئـەرمینیا و زۆر لای تـری سـیڤەر بەتـەواوی جێبەجێ نەکرا ، بۆ ئەوەی رونتر بێت لای هەموان ، لەپێشدا بزانین ئەو (٤٣٣) مادەیە چەندی جێبەجێ کراو چەندەشی مایەوە:

١- ئەوەی لێـی جێبـەجێ کـرا: هـەموو مـاددە بنـچینەییەکان جێبـەجێ کـراو ئـەو ولاٚتانەی لەژێر دەستی عوسمانی بوو لێی جیاکرایەوە و ولاٚتـانی عـەرەبی پـێ دروسـت بـوو ، بـەجۆرێك عێـراق و سـوریا بـەپێی مـاددەی (٩٤-٩٩) ، میـسر بـەپێی مـاددەی (١٠١-١١٣)، سودان لە (١١٣-١١٤)، مەغریب و تونس لە ماددەی (١٨٨-١٢٠) ، لیبیا لە ماددەی (١٢١-١٢٢). هەروەها فەلەستینیش دیاری کرا بـە ماددەکـانی (٩٤-٩٩) ، حیجاز بەپێی مادەکـانی (٩٨-٩٩) ، هەریەکـە لـە قـوبرس (١١٥-١١٧) و.. بـەجۆرێك جێبەجێ کرا.

[٥٥] میساقی نەتەوە ەیەکگرتوەکان لە ١٩ بەندو ١١١مادە پێك هاتووە ،بەندی حەفتەم لە مادەی ٤٩ دەست پێ دەکا تامادەی ٥١ .

هـەروەها ماددەکـانی سـەبارەت بـە قەرەبۆکردنـەوەی جـەنگ کـە لـە ماددەکـانی (٢٣١–٢٥٧) جێبـەجێ کـراو لـەوەش زیـاتر بەشـێك کەوتـە سـەر ئـەو وڵاتانـەی تـازە دروستکراون و لە میراتی عوسمانی جیاکرانەوە ، بەشێکیش کەوتە ئەستۆی دەوڵـەتی عێراقی.

لێرەدا پێویستە هەڵوەستەیەك لەسەر دروستبونی دەوڵەتی عێراقی بکـەین بـەهۆی ئەو رێکەوتننامەیە بۆ ئەوەی دەوڵـەتی عێراقـی ئێـستا نکـوڵی لـە کاریگـەریی یاسـایی سیڤەر نەکا بەسەر هەر رێکەوتنێکی هەرێمی کوردستان و بەغدا کە دەکرێ.

# دەوڵەتی عێراقی لە سیڤەر:

وشەی عێراق فارسیە بەمانای ئەراك (شاری شاهان) ، ناوچەی کوفە تا تەیسەفۆن (مەدائن) پێی وتراوە عێراق ، بەڵام دوای لەسەر نەخشە ئیسلامی و غەیرە ئیسلامیەکاندا تۆمارکرا ، عێراقی عەرەبی بەو ناوچەیەی نێوان کوفە و بەسرە وتراوە ، بە کوفە و ناوچەکانی تری فارس وتراوە عێراقی عەجەمی.[٥٦]

لە کتێبە ئیسلامیەکان کە دەڵێ (عولەمای عێراق –مەبەستی عولەمای ئەهلی رەئی بووە) مەبەستیشی عولەمای ئەو ناوچەیە بووە ، زیاتر عێراقیش عەرەبی نەبووە ، شارەکانی ئێستای عێراق لەکۆنەوە ناوی عەجەمی هەلگرتووە ، بەغدا (یاغی داد) ، سامڕا (سام ڕا) ، موسڵ (نیو–ئەردەشیر) ، مەدائین (تیسفۆن) ، بابل (بافیل) ، حەدیسە (نۆ دێ).. بەو شێوەیە بووە ، یاقوت حەمەوی باسی کێشەیەك دەکا لە (حلە) لەنێوان کورد و (ئەهلی جامیعە) ، باس لەوە ناکات کە عەرەبی لێبوە ، هەروەها لەو نەخشانەی کە (بلاد العرب)ی لێ تۆمارکراوە عێراقی لەگەڵدا نیە ، تەنها بە حیجاز و جەزیرە وتراوە بلاد العرب[٥٧] ، بۆیە عێراقی عەرەبی مێژووی سیاسیی نیە ، جگە لەوەی لە سەردەمی عەباسی پایتەختیان لە بەغدا بوو ، ویلایەتەکەش لە بەسرەوە تا سامەڕا دیاری کرا[٥٨] بێ ئەوەی دیاری بکرێ عیراقی عەرەبی یان عەجەمی ، ئەگینا لەسەردەمی عوسمانی لەمیانەی (٣٢) ویلایەت ، ویلایەتێکیش نەبوو بەناوی عێراق کەچی کوردستان گەیشتە ئاستی ئیالەت ، هەر بۆیە ناوی (عێراق) زۆر کەم بەکارهاتووە ، زیاتر میزۆپۆتا میا و وادی رافیدەین بەکارهاتووە ، ئەویش لە ناوچەکانی سەرووی بەغدا تا سەرچاوەی دیجلە و فورات دەگرێتەوە ، ناوی تری دەڤەری هەبووە وەك سەواد.

---

[٥٦] بڕوانە نەخشەی ئیبن حوقل و معجم البلدان و سیاحتنامە و شرفنامە و...

[٥٧] بڕوانە هەموو نەخشە کۆنەکانی هیرۆدتس لە یۆنانیەکان، هەروەها ئیبن حۆقل ،ئەلبیرۆنی ،ئیدریسی ...

[٥٨] بڕوانە نەخشەی ئیداری عەباسی .

هەربۆیەش ناوی عێراق زۆر نامۆ بووە بە خەڵکەکەشی ، کە کێشەی ویلایەتی موسڵ دەرکەوت لە نێوان ١٩٢٣–١٩٢٥ ، خەڵکی موسڵ تا سامەڕا ناوی عێراقیان هەر نەبیستبوو[٥٩]. هەتا دەبینین لە رێکەوتنامەکانی فەرمی سەرەتای سەدەی بیستەمیش ئەو ناوە بەکارنەهاتوە ، لە سایکس–بیکۆ١٩١٦ لەسەر نەخشە پیتی (A,B) و رەنگی (سور و شین) بەکارهات بۆ دابەش بوونەکە ، لەبەر نەبوونی ناوێکی بەناوبانگ لە سیڤەر و سان ریمۆ وشەی میزۆپۆتامیای عەرەبی بەکارهات بۆ ناوچەکانی خوارووی بەغدا ، بۆ یەکەم جار وشەی عێراق (٢) جار لەمادەی (٣)ی لۆزان بە کار هاتووە[٦٠]، ناوچەیەکی بێ خاوەنیش بووە لەمێژووی نزیکدا زیاتر لە (١١) جار بەغدا ئاوا بەسانایی داگیرکراوە ، بۆیە تەنها دەوڵەتی عێراقی دەستکرد نیە بەڵکو خودی عێراقیش دەستکردی بەریتانیایە ، بەپێی بروسکەی (چەچل) بۆ جەنەراڵە بەرتانیەکان دەڵێ دەوڵەتێك دروست بکەن لەو ناوچانەی کە هێزەکانی بەریتانیای پێ دەگا[٦١]. بیرۆکەی دەوڵەت و عێراق بەریتانییەکی پەتییە ، یەکەم جار لە ماددەکانی (١ و ٢)ی سایکس–بیکۆی ١٩١٦ باس لە دەولەتێکی وا کرا لە بەغدا تا بەسرە بێ ئەوەی ناوی عیراق بێت ، دوای لە رێکەوتنی سان–ریمۆی ١٩٢٠ و رێکەوتنی لۆزانی ١٩٢٣ ویلایەتی موسڵیش خرایە سەری ، لە ماددەی (٩٤)ی سیڤەر دیاریکراو لەماددەی (١٣٢)ی هەمان رێکەوتننامە دانی پیاهێنرا لەلایەن تورکیا ، بەپێی مادەی (٢٢) عصبە الامم خرایە ژێر ئینتداب ، بەریتانیا خۆی بەڕێوەی دەبرد ، حکومەت و پەرلەمان و مەلیك و سوپای بۆ دروستکرد ، لە سەعات ١١ وپێنج دەقیقەی دووشەمەی رۆژی ١٩٣٢/١٠/٣بەریتانیا کردی بە(٥٧)ەمین ئەندام لە (عصبە الامم) ، بەو شێوەیە عێراق دروست بووە ، پێش ئەوەی بەریتانیا ئەو بیرۆکەی باسکردبێ یەك سکاڵا و داواکاری نابینیەوە خەڵکی ئەو ناوچەیە داوای عێراق و سەربەخۆییان کردبێ ، لە کاتێکا ئیرادەی دەولەت لەناو کورد لە چاو عیراق زۆر بەهێز تربوە ، بە پێی نوسراوی فەرمی ، نوێنەریان ناردوە تە کۆنگرە نێو دەولەتیەکان ، کەچی بەپێی مادەی (١٢)ی ئینتداب بەریتانیا لە جیاتی عیراق ئەرکی دەرەوەی بە ئەستۆ گرتبوو ، واتە چۆن دەولەتی

[٥٩] بڕوانە : د فاضل حسین – مشکلة الموصل ص٨٠
[٦٠] بروانە دەقی ریکەوتنامەی لۆزان بە ئینگلیزی هەیە.
[٦١] الأسلام والعلمانية...ص٢٤٣

ئیسرائیل دەستکردە ئاواش ئەو دەولەتانە دەستکرد و نا پەسەندن ، ئەوەی گرنگە لێرەدا بۆ رەوتی باسەکەمان ئەوەیە دەوڵەتی عێراقی بەپێی ماددەی (٩٤)ی سیڤەر دروست بووە ، واتە لە هەموو وڵاتانی تر پێویست ترە رێز لە سیڤەر بگرێت ، واتە ئەوە کۆڵەکەیەکی سیاسی و یاسایی بەهێزە بۆ مامەڵەکردن وەك بارودۆخێکی تایبەتی لەنێوان بەغدا و کوردستان.

## کێ میراتگری یاسایی عوسمانییە؟

بۆ ئەو مەبەستەش دوو تەوەری (ناکۆکی) یان گرتەبەر ، لەلایەك خۆیان بە خاوەن میرات هەژمار دەکرد ، لەلایەکی تریش بە هەموو شێوەیەك خۆیان داماڵی لە مێژووی عوسمانی* و بەو شێوەیە ، تەنانەت کەمالیەکان قایل نەبوو بڵێن تورکیا لە چوارچێوەی وڵاتانی ئیسلامی هەژمار بکرێت ، هەروەك لەساڵی ١٩٣٢ بەپیر ئەو داوەتنامەیە نەچوو بۆ ئەو مەبەستە ، یان هەتا خۆیان بە دەولەتی ئاسیایی حیساب بکەن ، ئینجا جلوبەرگی ئایینیش قەدەغەکرا و پشووی هەفتەشی لە ڕۆژی هەینی هەلگرت .

لەلایەکی تریشەوە خۆی بە میراتگری هەژمار دەکرد و لەسەر ئەو بنچینە یاساییە داوای ویلایەتی موسڵی کردەوە ، لەوەش رەهەندی یاسایی بەکارهێنا ئاخۆ بۆچی داوای ویلایەتەکانی بەغدا و شام و ویلایەتەکانی تری عەرەبی نەکردەوە ، تەنها داوای ویلایەتی موسڵی کردەوە؟ تورکیا پێی وابوو ئەو ویلایەتانە لە جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤–١٩١٨ گیراون ، کەچی ویلایەتی موسڵ لەدوای وەستانی جەنگ بەپێی

* ، ئەو هەنگاوانەی خوارەوەی نا تا دورکەوێتەوە لە ئاسەواری عوسمانی:
١- لە ١٩٢٠/٧/١ یاسای جینائی هێنایە جێی سنورە شەرعیەکان.
٢- ١٩٢٢/١١/١ سەڵتەنیەتی هەڵوەشاندەوەو سوڵتان محەمەد واحدالدین دەرکرا.
٣- لە١٩٢٢ پایتەخت لە ئەستەمبۆل گواستەوە بۆ ئەنقەرە.
٤- لە ١٩٢٣/١٠/٢٩ خەلافەتی وەرچەرخاندە سەر کۆماری و ئەتاتورکیش بووە سەرکۆمار.
٥- لە ١٩٢٤/٣/٣ خەلافەت هەڵوەشێنرایەوە.

مادەی(٧ی هودنەی مۆدرسی ١٩١٨/١٠/٣١) داگیرکراوە ، واتە خۆی بە خاوەنی هەموو میراتی عوسمانی زانیوە و جێبەجێکردنی سیڤەری دەکەوێتە ئەستۆی.

بۆ ئەوەی کۆتایی بەو (دوڕوویيە یاسایيە)ی تورکیا بهێنین ، پێویستە بەو پرسیارە چارەسەری بکەین ئاخۆ تورکیا میراتگری عوسمانیە ، یاخود شەخسیەتێکی یاسایی جیایە؟ یان کێیە میراتگری یاسایی عوسمانی؟.

هیچ بەڵگەیەك نیە بیسەلمێنێ کە تورکیای نوێ میراتگری عوسمانییە ، جگە لەوەی هەردوولا تورکن ، پایتەختیشیان لەو ولاتەیە ، ئەگینا ناسنامەی عوسمانی و ناسنامەی تورکیای نوێ زۆر لێك جیایە ، ئەوەش بەراوردە بنەماییەکانە:

| عوسمانی | تورکیای نوێ |
|---|---|
| ١- ئیمبراتۆری بوو | ١- کۆمارییە |
| ٢- هەرێمەکەی بریتی بوو لە هەموو نیشتمانی ئیسلام و گەلەکەشی بریتی بوو لە ئوممەی ئیسلامی. | ٢- هەرێمەکەی خاکی تورکیایە و گەلەکەشی تورکن. |
| ٣- مێژووی خەلافەتی عوسمانی لە سەدەی ١٦ دەست پێدەکا و بەپێی بەیعەت و شەریعەت دروست بووە. | ٣- مێژووی تورکیای نوی لە ١٩٢٢ دەست پێدەکات ، بەپێی مادەی (١٢)ی ویلسۆن و هەردوو رێکەوتنی سیڤەر و لۆزان. |
| ٤- پابەند بوو بە شەریعەت و چەمکی ئیسلامی | ٤- پابەندە بە عەلمانیەت و سەروەری تورك |
| ٥- سوڵتان بە بەیعەت و مەرجە ئیسلامیەکان کە لە عەباسی وەرگرتبوو. | ٥- ئەتاتورك ئەو مەرجانەی لە پەرلەمانی تورکیا وەرگرت ، یاخو بەشێکیش دەڵێن لە رۆژئاوای وەرگرتووە. |
| ٦- بەرپرس بوو لە جیهانی ئیسلامی بە هەموو نەتەوەکانەوە | ٦- تەنها لە تورك بەرپرسە. |

هەروەك لە پێشوش باسمان کرد ، ئەتاتورك هەنگاوی زۆری نا بۆ پچڕینی هەر داوێك کە تـ وکیا بباتەوە سەر عوسمانی و زۆربەی ئاسەوارەکانی عوسمانی کوژاندەوە ، کەواتە تورکیای نوێ درێژ کراوەی عوسمانی نیە و لە چوارچێوەی نەخشە و پلانەکانی

سایکس–بیکۆ ١٩١٦ و سان–ریمۆ ١٩٢٠ و سیڤەر ١٩٢٠ و لۆزانی ١٩٢٣ دروست بووە ، کە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پێ دروست بوو ، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین دەبینین تورکیای نوێ بەو ئاکارە دروست بووە کە لە رێکەوتننامەی سیڤەر و ماددەی (١٢)ی بنەماکانی ویلسۆن[٦٢] هاتووە ، دواییش بە مەرجەکانی لۆزان قایل بووەو ئەو تورکیا نوێیەی لێ هاتەدی ، ئیتر هیچ بەڵگەنامەیەك یان وەسیەتێك یان بنچینەیەکی شەرعی نادۆزینەوە کە دەسەڵات لەلای دوا سوڵتانی عوسمانی بگوازرێتەوە بۆ مستەفا ئەتاتورك ، بەپێچەوانەوە ئەو دوو لایە زۆر ناکۆك بوون (وەك لە کێشەی نێوان ئەنقەرە و ئەستەمبۆل باسمانکرد).

لە وڵاتان وا بوەتە نەریت کە ئیمبراتۆرییەك یاخود دەوڵەتێکی گەورە هەڵدەوەشێتەوە ، کێ خاوەنداری (ناوەند) بکا ئەو بە میراتگری هەژمار دەکرێ ، وەك سۆڤیەت و یۆگسلافیا ، لەراستیدا لەوەش تورکیای نوێ نابێتە میراتگر ، چونکە پایتەختی عوسمانی ئەستەمبۆل بوو ، ئەوەی تورکیا ئەنقەرەیە ، زیاتر بەوە دەچوو چۆن عوسمانی هەڵوەشایەوە دەوڵەتانی سوریا و عێراق و لبنان ... لێ دروست بوو ، ئاواش تورکیا هەموو بەڵگەنامەکانی عوسمانی بپشکنی بروسکەیەك فەرمانێك یان نامەیەك نادۆزیەوە وەك بنچینەی یاسایی بۆ تورکیای نوێ ، یاخود بۆ وڵاتانی تری عەرەبی ، تەنها بروسکەیەکی عەلی ئیحسان پاشا نەبێ لە رۆژی ٣/ ١٠/ ١٩١٨ بۆ شێخ مەحمودی حەفیدی ناردووە و تیایدا هاتووە کە مومتەلەکاتی عوسمانی لە تەواوی ئەو ناوچەیە بۆ حکومەتەکەی شێخ مەحمودە ، ئەوەش پاڵپشتێکی یاسایی زۆر گرنگە ، هەم بۆ شەرعیەتی حکومەتی کوردستان و هەم بۆ هەر سێ ماددەی (٦٢، ٦٣، ٦٤) کە عوسمانی پێش و دووای سیڤەر دانی پیاهێناوە و مەرجە یاساییەکانی تەواو دەکات.

---

[٦٢] بڕوانە دەقی (١٤) بنەماکانی ودرۆ ویلسن کە لەساڵی ١٩١٨ دەری کرد.

# سەرەنجام و پێشنیار

**كەواتە پەیماننامەی سیڤەر لەرووی یاساییەوە هەڵنەوەشاوەتەوە لەبەر ئەوەی:**

١- هیچ بەندێك نە لە سیڤەر خۆی و نە لە لۆزان ئاماژە بە هەڵوەشانەوەی سیڤەر ناكات.

٢- لەلای عوسمانی هادی پاشا و د . رەزا توفیق (نوێنەری تایبەتی سوڵتان بوون ) ، دوای دوو ساڵ لە جەنگ وەستان ئینجا هاتە سیڤەر ، جەنگ لەگەڵ عوسمانی لە٣١/١٠/ ١٩١٨ وەستا ، جەنگ وەستانی سەرانسەریش لە سەعات (١١)ی رۆژی ٣٠/١١/١٩١٨، كەچی سیڤەر لە ١٠/٨/١٩٢٠بەسترا ، لەوێش بە زۆر نەكرا* ، بەئارەزووی خۆی مۆری كردووە ، بەلایەن كەمەوە خۆی لەژێر فشاری چەك نەبووە.

٣- هیچ ماوە یەكی زەمەنیش بۆ سیڤەر دیاری نەكراوە تا ئەگەر تەواو بوو ئەویش لەگەڵی تەواوبێت.

٤- لایەنەكانی مۆركەری رێكەوتننامەكە هەڵنەستاون بە هەڵوەشاندنەوەی (ئیلغاكردنی) ، تەنانەت لە توركیای نوێش كە (سیڤەری بە مەرگی توركیا ناوزەدكردووە) تا ئەم ساتەش بە فەرمی سیڤەری هەلنەوە شاندۆتەوە .

٥- هیچ لایەك هەڵنەستاون بە پێشێلكاری جەوهەری.

٦- پەیرەوكردنەكەش مەحاڵ نەبووە.

٧- راستە ئەو لایەی مۆری كرد (عوسمانی) بوو لەسەر زەمین نەماوە ، بەپێی رێكەوتننامە نێودەوڵەتییەكان مەحال نیە لە دوای خۆی رێكەوتننامەكان هەڵبوەشێتەوە ، بەلأم (إستثناء-بەدەر) بۆ سنوری نێودەوڵەتی دانراوە واتە بەنەمانی دەولەتەكەش سنور دەستكاری ناكرێ ، هەڵبەتە ماددەكانی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤) یش سنوری نێودەوڵەتی بوو بۆ دیاریكردنی سنوری خوارووی توركیا ، هەروەك چۆن بەشەكانی تری سنور هەر بەو پەیماننامەیە جێبەجێ كرا.

---

* لە (G.E.British نوسخە عەرەبیەكەی بەناوی ١٠الموسوعه العالميه العربيه) لەماددەی: المعاهده، لەوبارەیەوە هاتووە: ( لا تبطل المعاهدة بإستعمال القوة، الا اذا كانت القوة قد استعملت فعلا ضد ممثل الحكومة الذى قام باعداد احكام أو شروط المعاهدة)

٨- لە هەمووی گرنگتر تا ئەم ساتەش نەخشەی سیاسی و یاسایی تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەپێی ئەو پەیماننامەیەیە.

٩- هەرچەندە کورد تێبینییان هەبوە (بەتایبەتی لەبارەی سنوری) بەڵام ڕەزامەندیان بۆ ئەو ڕێکەوتننامەیە هەبوە ، لە پێش و دووای سیڤەریشەوە ، ئەوانەی خوارەوەش بەڵگەن:

* نامەی شێخ عبدالقادری شمزینی بۆ کۆمیسری بەرزی کۆماری فەڕەنسا لە ١٩٢٠/٦/٢٥ لە بەڵگەنامەی (ژ:٤٤) بەڵگەنامەی فەڕەنسی لە کتێبی (کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردییەکان ١٩٠٨-١٩٢٣) لە بەڵگەنامەی بەریتانیی و فەڕەنسی- ل١٥٨).

* نامەی هەریەکە لە ئەمین عالی بەدرخان بۆ هەمان شوێن لە ١٩٢٠/٦/١٦.

* جەمعیەتی ئیجتیماعی کوردی و یانەی کورد و... زۆر لای تر.

هەروەهاش سەرکردە کوردەکانی تریش لە نامەکانیاندا بەکاریان هێناوە ، مەلا مستەفا ، تاڵەبانی ، بارزانی ، تا ئەو ساتەش بەکاردێت ، بەیانی فیدراڵیش پاڵپشتی کردۆتە سەر سیڤەر.

کەواتە پەیماننامەی سیڤەر ماددەیەکی بەهێزی بارودۆخی یاسایی ئێستای هەرێمی کوردستانی خواروە ، هەروەها بۆ دوو بەشی کوردستانی سەرو و ڕۆژئاواش * بەهێزە ، هەروەها بەگشتی بۆ مافی چارەنوسی کوردستان و بۆ تێگەیشتن لە دۆزی کورد و بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئەو دۆزە و هەنگاونانی زیاتر بەرەو چارەنووسی بەپێی یاسای نێو دەولەتی... بۆ هەمووئەوانە پێویستە.

* دەی خوێنەری بەڕێز، ئێستا دەزانی بۆ بەو رادەیە کاریگەر نیە لەسەر کوردستانی ڕۆژهەڵات؟ لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، ئەویش ئەوەیە، سیڤەر تەنها میراتی عوسمانی دەگرێتەوەو کوردستانی ڕۆژهەڵاتی تیانیە.

# راسپاردە و پێشنیار

لە ژێر رۆشنایی ئەو توێژینەوەیە گەیشتینە چەند سەرەنجامێکی گرنگ ، لەوانە:

١- سیڤەر لەرووی یاسایی هەڵنەوەشاوەتەوە.

٢- تەرجەمەی ناوەرۆکی ئەو رێکەوتننامانە بەسەلامەتی نەبووە ، هەوڵدراوە هێزی یاساییەك نەبێتە ژێرخانێکی یاسایی بۆ هەرێمی کوردستان و خواستەکانی تەواوی کوردستانیان ، بەپێچەوانەوە سەروەری بەو قەوارە دەستکردە دەوڵەتیانەی وەك عێراق و تورکیا و سوریا و ئەردەن و... هتد دراوە بەبێ بنچینە.

٣- بەشێك لەو رێکەوتننامانە جێبەجێ کراوە و بەشێکی ماوەتەوە.

٤- سەرجەم هەلوێستی ڕۆژئاوا بەرامبەر کورد نە ڕوون بووە نە یەك هەلوێستیش بووە ، هەمان شێواز لە ئیستاشدا بەدی دەکرێ .

**بۆ چارەسەری** و سود وەرگرتن لەو بارە یاساییەی ئەو رێکەوتننامانە و بۆ ئەوەی ببنە سەنەدێکی یاسایی باری سیاسی ئێستای کوردستان ، دەبێ سەرنج و تێفکرینێکی قوڵ بۆ ئەو بابەتە بکەین و لەسەر ئەو بنچینەیە پێشنیار دەکەین:

١- لیژنەیەکی پسپۆر تەرخان بکرێت تایبەت بە توێژینەوەی یاسایی لەو پەیماننامە و رێکەوتننانە ، بەجۆرێك کە فیقهی وای لە دەقەکان دەربهێنرێ لە بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان بێت.

٢- ئەگەر کورد خۆشی نەیبێ ئەوا یاساناسێکی نێودەوڵەتی بەکاربهێنێ بۆ زیندووکردنەوەی ئەو پەیماننامەیە و ماددەکانی ٦٢ هەتا٦٤.

٣- لۆبی کوردی لەو وڵاتانە بەکار بهێنرێ کە پەیماننامەکەیان مۆرکردووە بەتایبەتی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا.

٤- سەرکردایەتی کورد بتوانێ خواستەکانی لەو هاوپەیمانیە بەجۆرێك زیندوو بکاتەوە کە پاساویش بێت بۆ پرۆژە چاکسازییە سەرەکیەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست ، بۆ پرۆژەی ئەمریکی ، ئەوروپی ، ئیسلامی و هەتا عروبیش.. مەحاڵیش نیە ، ئەگەر

پێویست بوو هاوسەنگی ئەو پرۆژەیەش (زیندوکردنەوەی سیڤەر ) لە ئەستۆی خودی کورد بگرێت .

ئەوەش ڕێ خۆش دەکا بۆ هەنگاوێکی مەزن تر ، ئەویش ئەوەیە هێزە سەرەکیەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست پرۆژەی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ چاکسازی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تەنها کورد نیەتی ، دەکرێ ئەو پرۆژەیە بکرێتە دەروازەیەك بۆ پرۆژەی کوردی سەبارەت بەچاکسازی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست .

٥- تا ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو بارودۆخێکی لێکچووی سەردەمی سیڤەر بگۆڕێ بۆ کورد باشترە ، واتە ئەگەر تورکیا بەرەو ئیسلامی و نەریتی عوسمانی بڕوا باشترە نەك عەلمانیەتی ئەتاتورکی ، پرۆژەکەی ئەردۆگان بۆ گواستنەوەی پایتەخت لە ئەنقەرە بۆ ئەستەمبۆل ، و بەو پێیە کێشەکانی : ئەرمەن ، کێشەی ویلایەتی موسڵ ، پرۆژەکانی ئەمریکا ، پرۆژەکانی رابوونی ئیسلامی و داوای خەلافەت کردن ، پرۆژەی یەکێتی عەرەب هەموو ئەوانە زیندوو بکرێتەوە لە قازانج و ستراتیژیەتی کوردە ئەگەر خاوەنی ستراتیژیەت و توێژینەوی ئەکادیمی بێت بۆ هەنگاوە سیاسی و یاساییەکانی.

٦- دەکرێ ئێمە خۆشمان لەسەر خاڵی (٥) کاربکەین ، بەشێك بین لە هاندانی ئەو فاکتەرانە بەو ئاراستەیە ، نەك هەر تەنها چاوەڕێی روداوەکان بین .

٧- تا وڵاتانی نەوەی سیڤەر (تورکیا ، عێراق ، سوریا،...) بەرەو مەدرەسەیەکی ناتەبا لەگەڵ (وفاق الدولی) بڕۆن لە خزمەتی ئەو پرۆژەیە ، پێچەوانەش بە پێچەوانەیە .

٨- باری زیندووکردنەوەی سیڤەر قورسە ، رەنگە بە تەنها بەکورد نەکرێ ، هەوڵ بدەین هەندێ شەریك بۆ هەڵگرتنی ئەو بارە بدۆزینەوە ، ئەگەر بەوردی بەناو کونج و کۆلانەکانی مادەکانی سیڤەر بگەڕێین دەتوانین زۆر شەریك بدۆزینەوە ، زۆر لایەنی تر هەیە قازانجیانە ، هەرە نزیکەکەیان ئەرمینیا و یۆنانە ، ئینجا بتوانن کێشەی ئەسکەندەرونە لەنێوان سوریا و تورکیا بوروژێنین ، هەروەها کێشەی ویلایەتی موسڵ... هەموو ئەوانە لە کات و ساتی خۆی و بەوەستایانە بکرێت سەرەنجام دۆخێك دروست دەبێت کە نێوبژی کردن بۆ ئەو کێشانە بە پەیماننامەی سیڤەر دەبێتە

خواستێکی ئیقلیمی و دوەلی و ئەوکاتیش دەرفەتی زێڕین بۆ کورد دێتەوە لەنێو یاسای نێودەوڵەتی کە ماوەی یەك سەدەیە بەسەرماندا داخراوە.

٩- بتوانین تاوانی جینۆسایدی ئەرمەنی (کە ئێستا گەرمە و خاوەنی نێودەوڵەتی هەیە) بگێڕینەوە بۆ سەر تورکیا نەك عوسمانی ، هەر خۆشی لە ئەسڵدا وایە ، زیاتر لەوەش بگێڕێنەوە نێو مادەکانی سیڤەر ، خۆش بەختانە مادەی (١٤٢)ی سیڤەر بەراشکاوانەیەکی یاسایی باس لەو تاوانە دەکاو بەتیرۆر وەسفی دەکاو ئاماژە بە حکومەتی ئیتحادوالترقی دەکا ئەوەش بناغەی تورکیای نوێیە ، بۆیە هەر هەوڵێك بە هەڵەیی بۆ توشکردنی کورد یان عوسمانی بەو تاوانە هەڵەیەکی کوشندەی ستراتیژییە.

١٠-لە کۆتایدا مادەی سیڤەر بکەینە بنچینەیەکی تری یاسای نێو دەولەتی بۆ پرسەکانی سەرانسەری کورد و گەیشتن بە مافی چارەنوس کە لە مادەی (١)ی بەشی یەکەمی میساقی نەتەوە یەکگرتەوەکان هاتوە ، هەروەها پالپشتێکی یاسایی ڕوونە بۆ مادەی ١٤٠ وهەر ناوچەیەك چ ئیستا و چ لە داهاتوو دەبیتە ناکۆکی نێوان نەتەوە و ولاتان .

کۆتایی

## لێکۆڵەر لە چەند دێڕێکدا : ( مسعود عبدالخالق)

١ – لە دایك بووی ساڵی ١٩٥٧ – هەولێر / مخمور .

٢ – خویندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردووە .

٣ – لە ساڵی ١٩٨١ زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە .

٤ – لە دوای دەرچوونی لە زانکۆ پەیوەندی بە شۆڕشی کوردستانەوە کردوە .

٥ – لە ساڵی ٢٠٠٧ ماجستێری لە (فلسفەی زانستە سیاسیەکان) لە زانکۆی بەریتانیا هێناوەتەوە .

٦ – ئێستا خاوەنی ئیمتیازی دەزگای ڕاگەیاندنی ستاندەرە .

٧ – چەندین کتێب و توێژینەوەی هەیە .

## زاراوە پێویستەکان

١- وڵاتانی هاوپەیمان و وولاتانی تەوەر: ئەو وڵاتانەی لەگەڵ ئەڵمانیا بوون وەك مەجەر ، نەمسا ، بولگاریا ، دوایش عوسمانی پێیان وترا وڵاتانی تەوەر ، ئەو وڵاتانەی لەگەڵ فەڕەنسا و بەریتانیاش بوون وەك ئیتالیا ، بلجیکیا ، ئەمریکا ، ڕوسیا پێیان وترا هاوپەیمانان.

٢- تورکیا و عوسمانی: لەو ڕێکەوتنە ناوی عوسمانی بە تورکیا هاتووە ، کەچی ئەوکاتە تورکیا نەبووە ، بەڵام لە ئەدەبیاتی ئەوروپا زیاتر ناوی تورکیا بەکارهاتووە بۆ عوسمانی ، بۆ کێشەکەش بەناوی (پرسی ڕۆژهەڵات – قضية الشرق) هاتووە.

٣- سیڤەر شارێکە لە ڕۆژئاوای پاریس لە فەڕەنسا.

٤- شای حیجاز ئەوکاتە شەریف بن حسین بن علی بوو باوکی مەلیك فەیسەڵی عێراق و باپیرەی مەلیك حسێنی ئوردەن ، هاوپەیمانی هەبوو لەگەڵ ئینگلیز لەدژی عوسمانیەکان ، دوایی لە ساڵی ١٩٢٤ بنەماڵەی ئال سعود توانیان تەواوی جەزیرە لەوانە بسێننەوە.

٥) میزۆپۆتامیای عەرەبی ، لە بنەچەدا میزۆپۆتامیا بەو ناوچانەی نێوان دیجلە و فورات و لە جەزیرە و بۆتانەوە تا بەغدا وتراوە ، لەبەرئەوەی ناوی عێراق باو نەبوو ناچار میزۆپۆتامیای عەرەبی بۆ ناوچەکانی بەغداو بەسرە بەکارهات .

٦- ئۆتۆنۆمی خۆجێیی (بەدرێژی رونکراوەتەوە ).

٧- ڤێرسای: ئەو رێکەوتننامەیە بوو کە هاوپە یمانان تایبەت لەگەڵ ئەڵمانیا کردویانە و لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم .

# دەقی پەیماننامەی سیڤەر

**پەیمانی ئاشتی نێوان هاوپەیمانەکان و هێزە پەیوەندیدارەکان وتورکیا لە١٠ی ئابی ١٩٢٠ لە سیڤەر مۆرکرا .**

هەریەك لە ئیمبراتۆریەتی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا و یابان ، وەك هاوپەیمانە بنەڕەتییەکان وەسف کراون ، هەرچی ئەرمینیا و بەلجیکیا و یۆنان و حیجاز و پۆڵەندا و پورتگال و رۆمانیا و دەوڵەتی سیرب و کروات و سلۆڤینیا و چیکۆسلۆڤاکیا ، ئەو دەوڵەتانە لەگەڵ هێزە بنەڕەتییەکان کە پێشتر ئاماژەیان پێکراوە ، لایەنێك پێك دێنن ، وە تورکیا لایەنەکەی تر پێك دێنێ.

لەسەر داوای حکومەتی ئیمپراتۆری عوسمانی ، لە ٣٠ تشرینی دووەمی ١٩١٨ ئاگر بەست لەلایەن هێزە هاوپەیمانە بنەڕەتیەکان بە تورکیا بەخشرا بۆ ئەوەی پەیمانی ئاشتی بە ئەنجام بگەیەنرێ ، وە بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هێزە هاوپەیمانەکان وەك یەك ئارەزوی ئەوەیان هەیە ، وە بە پێویستی دەزانن کە ئاشتییەکی جێگر و دادەوەرانە و درێژخایەن جێێ جەنگ بگرێتەوە ، ئەو جەنگەی نێوانیان کە تیایدا یەك لەدوای یەك راستەو خۆیان ناڕاستە وخۆی دژی تورکیا تێوەی گلابون ، ئەو جەنگەی کە لە بنەڕەتدا لە ٢٨ی تەموزی ١٩١٤ کە لەلایەن حکومەتی ئیمپریالی و شانشینی نەمسا- هەنگاریای پێشوو دژی سربیا راگەیەنرا و دەستی پێکردوە. هەروەها بەو دوژمنکارییانە دەستی پێکرد کە تورکیا کردی بەرامبەر هێزی هاوپەیمانان لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ و لەم شەڕەشدا ئەڵمانیا بووە هاوپەیمانی تورکیا.

بۆ ئەم مەبەستە لایەنە باڵایە گرێبەستەکان ئەمانەی خوارەوەیان وەك باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خۆیان دەستنیشان کردوە:

- خاوەن شکۆ شای شانشینی یەکگرتووی بەریتانیای مەزن و ئایرلەندا و موستەعمەرە سەربەخۆکانی ئەودیو دەریا ، ئیمبراتۆری هند .
- بەڕێز جۆرج دکس گراهام .K.C.V.O وەزیری دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆی بەریتانیا لە پاریس ، بە نوێنەرایەتی موستەعمەرەی سەربەخۆی کەنەدا.

- ڕێزدار ڕێز جۆرج هەڵسی پێرلی .K.C.M.G کۆمیسەری باڵای کەنەدا لە شانشینی یەکگرتوو ، بە نوێنەرایەتی کۆمنوێلسی ئوستراليا .
- پایەدار ئەندرۆ فیشەر کۆمیسەری باڵای ئوستراليا لە شانشینی یەکگرتوو ، بە نوێنەرایەتی موستەعمەرەی سەربەخۆی نیوزلەندا .
- بەڕێز جۆرج دکس گراهام .K.C.V.O باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆی بەریتانیا لە پاریس ، بەنوێنە رایەتی یەکێتی ئەفریقیای خواروو .
- بەڕێز ریجنالد ئەندرۆ بلانکنبێرگ .O.B.E ، کۆمیسەری باڵای یەکێتی ئەفریقیای خوارو بەوەکالەتی شانشینی یەکگرتوو، بە نوێنەرایەتی هند .
- بەڕێز ئارسەر هرتزل .K.C.B ، یاریدەدەری جێگری وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری هند ،
- سەرۆك کۆماری فەرەنسا.
- بەڕێز ئەلیکساندەر میلەراند ، سەرۆکی ئەنجومەن ، وەزیر بۆ کاروباری دەرەوە .
- بەڕێز فردریك فرانسوا مارسال ، وەزیری دارایی .
- بەڕێز ئۆگەست پۆل–لویس ئیسحاق ، وەزیری بازرگانی و پیشەسازی .
- بەڕێز جولس کابۆت ، باڵیۆزی فەرەنسا .
- بەڕێز جۆرج مۆریس پەلیۆلۆگ ، باڵیۆزی فەرەنسا ، سکرتێری گشتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە .
- خاوەن شکۆ شای ئیتاليا .
- خانەدان لیلیۆ بۆنین لۆگیر ، ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی (سەنەتۆر)ی شانشین ، باڵیۆزی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراو خاوەن شکۆ پاشای ئیتاڵیا لە پاریس جەنەراڵ جیۆڤانی ماریتی ، نوێنەری سەربازی ئیتاڵیا لە ئەنجومەنی باڵای جەنگ .
- خاوەن شکۆ ئیمبراتۆری یابان .
- خانەدان چیندا ، باڵیۆزی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆ ئیمبراتۆری یابان لە لەندەن .

- بەڕێز K. ماتسیۆ، باڵیۆزی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆ ئیمبراتۆری یابان لە پاریس .

ئەرمەنستان (ئەرمینیا) :

- بەڕێز ئاڤێتیس ئەهارۆنیان ، سەرۆکی شاندی کۆماری ئەرمینیا ،
- خاوەن شکۆ شای بەلجیکییەکان .
- بەڕێز جولس ڤان دین هیوڤل ، نێردراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراو ، وەزیری دەرەوە.
- بەڕێز رۆلین جاکمینس ، ئەندامی پەیمانگەی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت ، سکرتێری گشتی شاندی بەلجیکی .
- خاوەن شکۆ شای یۆنان .
- بەڕێز ئیلێفسێریۆس K. ڤێنیزیلۆس ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران .
- بەڕێز ئاسۆس رۆمانۆس ، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆ شای یۆنان لە پاریس .
- خاوەن شکۆ شای حیجاز .
- سەرۆك کۆماری پۆڵەندا .
- خانەدان مۆریس زامۆیسکی ، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی کۆماری پۆڵەندا لە پاریس .
- بەڕێز ئیراسمی پیلتز .
- سەرۆك کۆماری پورتوگال .
- دکتۆر ئافۆنسۆ داکۆستا ، سەرۆکی پێشووی ئەنجومەنی وەزیران .
- خاوەن شکۆ شای رۆمانیا .
- بەڕێز نیکۆلا تیتۆ لێسکۆ، وەزیری دارایی .
- شازادە دیمیتری چیك ، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی خاوەن شکۆ شای رۆمانیا لە پاریس .
- خاوەن شکۆ شای سیرب و کروات و سلۆڤین .
- بەڕێز نیکۆلاس P. پاچیتچ ، سەرۆکی پێشوی ئەنجومەنی وەزیران .
- بەڕێز ئەنتی ترومبیك وەزیر بۆ کاروباری دەرەوە.

- سەرۆك كۆماری چیکسلۆڤاکیا .
- بەڕێز ئیدوارد بینیس ، وەزیر بۆ کاروباری دەرەوە.
- بەڕێز ستیڤن ئۆسوسکی، نێرراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵاتی پێدراوی کۆماری چیکسلۆڤاکیا لەلەندەن .

تورکیا:

- جەنەراڵ هادی پاشا (سەنەتۆر) رەزا تۆفیق بەگ ، سەنەتۆر .
- ریچاد هەیس بەگ ، نێردراوی نائاسایی و باڵیۆزی دەسەڵات پێدراوی تورکیا لە بێرن .

ئەو کەسانەی کە تەواوی دەسەڵاتی تەواوی خۆیان بەکارهێناوە بەشێوەیەکی لەبار و ئاسایی و لەسەر ئەمانە ی خوارەوە رێك کەوتوون:

هەر لەکاتی جێبەجێ کردنی ئەم پەیماننامەی ئێستا باری جەنگ کۆتایی دێت.

هەر لەو کاتەوە و بەپێی مەرجەکانی ئەم پەیماننامەی ئێستا ، پەیوەندی رەسمی لەنێوان هێزە هاوپەیمانەکان و تورکیا دێتە کایەوە.

**بەشی (١)**

# پە یماننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان ( میساق عصبة الامم )
# ماددەی ١ هەتا ٢٦ و پاشكۆ

سەيرى بەشى يەكەم ، پەيمانى ڤيرسايل Versailles لاپەڕە ١٠-٢٣ بكە.

**بەشی (٢)**

## سنورەكانى توركيا

### ماددەى ٢٧

لە ئەوروپا ، سنورەكانى توركيا بەم شێوەيەى خوارەوە جێگر دەكرێت:

١- دەرياى رەش:

لە دەروازەى بسفۆڕە وە هەتا خاڵێك كە لە خوارەوە وەسف دەكرێ.

٢- لەگەڵ يۆنان:

لە خاڵێكەوە لەسەر دەرياى رەش هەڵدەبژێررێ نزيك رژێنى (مصب)ى بيوك دەرە ، كە دەكەوێتە نزيكەى دورى ٧ كيلۆمەتر لە باكورى رۆژاواى پۆديما ، لەوێوە بەرەو خوارى رۆژاوا تا دورترين خاڵى باكورى رۆژاواى حەوزى ئيسترابخا دەرە (كە دەكەوێتە دەوروبەرى ٨ كيلۆمەترى باكورى رۆژاواى ئيسترابخا) ، هێڵێك لەسەر خاك جێگر دەكرێ كە بە كەپليجە داغ و ئوچبونەر تەپەدا تێدەپەڕێ.

لە وێوە بەرەو باشورى- باشورى رۆژهەلات هەتا خاڵێك كە لەسەر هێڵى شەمەندەفەر هەڵدەبژێرر ێت لە چۆرلو هەتا چاتەلجە كە دەكەوێتە دورى يەك كيلۆمەتر لە رۆژاواى ويستگەى شەمەندەفەرى سينەگلى ، هێڵێك بەپێى توانا لەگەڵ سنورى رۆژاواى حەوزى ئيسترابخەوە دەڕوا ، لەوێوە بەرەو خوارى رۆژهەلات هەتا خاڵێكى هەڵبژێراو لەنێوان فەنەرو كورفەلى لەسەر بە رزاييەكانى نێوان حەوزەكانى ئەو روبارانەى كە دەڕژێنە ناو بيوك چەكمەجەگول ، لەباكورى رۆژهەلات و حەوزەكانى ئەو

روبارانەی کە راستەوخۆ دەڕژێنە ناو دەریای مەرمەرە لە باشوری رۆژاوا ، هێڵێك لەسەر زەوی جێگر دەکرێت کە بە باشوری سینەکلی دا تێپەڕ دەبێ ، لەوێوە بەرەو باشوری رۆژهەڵاتەوە تا خاڵێك کە لەسەر دەریای مەڕمەڕە هەڵدەبژێررێت کە دەکەوێتە دوری یەك کیلۆمەتر لە باشوری رۆژاوای گەلیکراتیا ، هێڵێك بەم بەرزاییە رژێنانەدا تا بڵێی دوور دەکێشرێت.

٣- دەریای مەرمەرە:

لەخاڵێکەوە کە لەسەرەوە پێناسەکراوە هەتا دەروازەی بۆسفۆر.

لە ئاسیا ، سنورەکانی تورکیا بەم شێوەیە جێگیر دەکرێت:

١ =لە رۆژئاواو باشور:

لە دەروازەی بۆسفۆرەوە بۆ ناو دەریای مەرمەرە هەتا خاڵێك کە لە خوارەوە وەسف کراوە ، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست لە نزیك کەنداوی ئەسکەندەرۆنە نزیك کەرەتاش بورون دەریای مەڕمەرە و دەردەنیل و رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست ، دورگەکانی دەریای مەرمەرە ، ئەوانەی کە دەکەونە ناو دووری سێ میل لە کەنار دەریاوە ، وەك هی تورکیا دەمێنێتەوە ، ئەمانەش بەندن بە مەرجەکانی بەشی (٤) و ماددەی ٨٤ و ١٢٢، بەشی (٣) (بڕگەی سیاسی).

٢- لەگەڵ سوریا:

لەخاڵێکی هەڵبژێراوی سەر کەناری رۆژهەڵاتی دەروازەی (حەسەن دەدە) کە دەوروبەری سێ کیلۆمەتر دووره لە باکوری رۆژاوای (کەرەتاش بورون) ، بەرەو باکوری رۆژهەڵات بۆ خاڵێکی هەڵبژێراوی سەر کەناری جەیحون ئیرمەك کە دەوروبەری یەك کیلۆمەتر دووره لە باکوری بابەلی ، هێڵێك لەسەر زەوی جێگیر بکرێت کە بە باکوری کەرەتاشدا بڕوات و ، لەوێوە بۆ کەسك کەلا ، ئاوەڕۆی جەیحون ئیرمەکە و لەوێوە بەرەو باکوری رۆژهەڵات ، بۆ خاڵێك هەڵبژێراوی سەرجەیحون ئیرمەك کە دەوروبەری پانزە کیلۆمەتریێ رۆژهەڵاتی-باشوری رۆژهەڵاتی (کارس بازار)ە ، هێڵێك لەسەر خاك جێگیر بکرێت کە بە باکوری (کەرەتەپە) دا تێپەڕێ و لەوێوە پێچ بکاتەوە بۆ چێچێك لە جەیحون ئیرماك کە دەکەوێتە رۆژئاوای دول دول داغ و رێڕەوی جەیحون ئیرماك:

لەوێوە بە ئاراستەی باشوری رۆژهەلات بەگشتی بۆ خالێکی هەلبژێراوی سەر (ئەمیر موسی داغ) کە لە دەوروبەری پانزە کیلۆمەتری باشوری- باشوری- رۆژاوای (گیاوەرگولە) هێلێك لەسەر خاك جێگیر بکرێت کە نزیکەی هەژدە کیلۆمەترێك لە هێلی ئاسنی دوورە ، دول دول داغ بۆ سوریا بەجێ بهێلرێ:

لەوێ وە بەرەو رۆژهەلات بۆ خالێکی هەلبژێراو کە دەوروبەری پێنج کیلۆمەتری باکوری ئۆرفە هێلێکی بەگشتی راست و راست لە رۆژاواوە بۆ رۆژهەلات لەسەر زەوی جێگیر بکرێت کە بە باکوری ئەو رێیانەدا تێدەپەرێ کە شارەکانی باغچە و عەنتاب و بیریجیك و ئۆرفە بەیەك دەبەستنەوە و ئەو سێ شارۆچکەیەی ئامازەی پێکرا بۆ سوریا دابنرێ و لەوێوە لە رۆژهەلات وە هەتا باشوری رۆژاوای دورترین خالی ئەو پێچەی دیجلە کە لەدوای دەوروبەری شەش کیلۆمەتری باکوری ئازەخە (بیست و حەوت کیلۆمەتری رۆژاوای جەزیرەی ابن عمر)ە ، هێلێکی بە گشتی راست و راست لەسەر زەوی جێگیر بکرێت لە رۆژاوا بۆ رۆژهەلات و شاری ماردین بۆ سوریا بەجێ بێلی، لەوێوە بۆ خالێکی هەلبژێرراوی سەر دیجلە کە دەکەوێتە نێوان خالی بەیەك گەیشتنی ئاوی خابور و دیجلە و پێچێکی دیجلە کە دەکەوێتە دە کیلۆمەتری باکوری ئەو خالە و لەگەل رێرەوی دیجلە ، ئەو دورگەیەی کە دەکەوێتە شارۆچکەی ئیبن عومەر بۆ سوریا بێ.

٣- لەگەل ولاتی دوو روبار (بلاد الرافدين)

لەوێوە بەگشتی بە ئاراستەی رۆژهەلات بۆ خالێکی هەلبژێراوی سەر سنوری باکوری ویلایەتی موسل هێلێك لەسەر زەوی جێگیر دەکرێت.

لەوێوە بەرەو رۆژهەلات بۆ خالێك کە تیایدا سنوری تورکیا و فارس (ئێران) بەیەك دەگەن ، سنوری باکوری ویلایەتی موسل ، دەسکاری بکرێت بۆ ئەوەی بە باشوری ئامێدیدا بروات.

٤- لە رۆژهەلات و باکوری رۆژهەلات:

لەو خالەی کە لە سەرەوە دیارکراوە هەتا دەریای رەش، ئەو سنورەی کە ئێستا هەیە لەنێوان تورکیا و فارس (ئێران) ، پاشان سنوری پێشوی نێوان تورکیا و روسیا بەندە بە مەرجەکانی ماددەی ٨٩.

٥- دەریای رەش

## مادەی ٢٨

ئەو سنورانەی کە لەم پەیماننامەیە وەسف کراون لەسەر نەخشە بەپێوەری یەك بۆ ملیۆن کێشراوە و لەگەڵ پەیماننامە دراوە ، لەحاڵەتێك ئەگەر جیاوازییەك لەنێوان دەقەکە و نەخشەکە هەبێت دەقەکە کاری پێ دەکرێ (سەیری پێشەکی بکە)

## ماددەی ٢٩

کۆمسیۆنەکانی سنور کە پێکهاتەیان ئێستا جێگیر دەکرێ یان لەم پەیماننامەیە جێگیر دەکرێ یان لە پاشکۆی پەیماننامەی تر دیاری دەکرێت ، پێویستە ئەم سنورانەی ناو نەخشەکان لەسەر زەوی بکێشن.

ئەوان نەك هەر دەسەڵاتی جێگیرکردنی ئەم بەشە سنورانەیان کە وەك (هێڵێك لەسەر زەوی) دیارکراون ، بەڵکو ئەگەر کۆمسیۆن بەپێویستی زانی ، دەسەڵاتی پێداچونەوەی تەفاسیلەکانی ئەو سنورانەشیان هەیە کە بە سنورە کارگێڕییەکان یان هی تر پێناسەکراون ، ئەوان لە هەموو حاڵەتەکان هەوڵی تەواو دەدەن و بەپێی توانا پابەندی ئەو وەسفانە بن کە لە پەیماننامەکان داهاتوون ، ئەمەو بەپێی توانا سنورە کارگێڕییەکان و بەرژەوەندییە ئابوورییە خۆجێییەکان لەبەرچاو دەگرن.

بڕیار ەکانی کۆمسیۆن بەزۆرینە دەدرێت و پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکان پابەندی بن ، خەرجی کۆمسیۆنەکانی سنور بە یەکسانی دەکەوێتە سەرشانی لایەنەکانی پەیوەندیدار.

## ماددەی ٣٠

ئەو سنورانەی کە بە (ڕێی ئاوی) وەسفکراون ، دەستەواژەکانی (ڕێڕەو) یان کەناڵی دەریایی کە لەو پەیماننامەیەی ئێستادا هاتوون – ئەوانەی بە روبارەکانی نا – ئوستولی دادەنرێن – ، بە هێڵی ناوەڕاستی ڕێی ئاوی یان لقە سەرەکیەکەی دێن ، هەروەها ئەو ڕێ ئاوییانەی بە روباری ئوستولی (کەشتیوانی) دادەنرێن ، ئەوە ئەو روبارانە بەهێڵی ناوەندی کەناڵی سەر ەکی کەشتیوانی دادەنرێن! ئەو جیاکردنەوەیە بەگوێرەی پەیمانەکە لە دەسەڵاتی کۆمسیۆنەکانی سنور دایە ئەوە دیار بکا ئاخۆ ئەو

هێڵە سنوریە هاوبەشانە دەگۆڕێت ئەگەر ڕێڕەوەکە یان کەناڵەکە ئەگەری گۆڕانی هەبوو ، یان ئاخۆ ئەو هێڵە دەبێ تەواو جێگیر بکری بە پێی شوێنی ڕێڕەوەکە یان کەناڵەکە کاتێ پەیماننامەکە جێبەجێ دەکرێ ، ئەگەر مەرجی پێچەوانە لەم پەیماننامەیەی ئێستا نەبو ، ئەو دورگە و دورگۆکانەی کە دەکەونە ناو سێ میل لە کەنارەوە ، لەناو سنوری دەوڵەتی کەناریی دەبن (کامە دەوڵەتە لەو دوورییەی سەرەوە لەسەر کەنار بوو ، ئەو دورگە و دورگۆکانە بۆ ئەو دەبن).

## ماددەی ٣١

دەوڵەتە پەیوەندیدارە جیاجیاکان دەستەبەری ئەوە دەکەن کە هەموو ئەو بەڵگانامانە بدەن بە کۆمسیۆنەکان کە بۆ کارەکانیان پێویستن بەتایبەتی دانە ئەسڵیەکانی ڕێکەوتننامەکان کە سنورەکانی ئێستا یان هی پێشتر جێگیر دەکەن و هەموو ئەو نەخشانەی کە هەن و پێوەریان گەورەیە و زانیاری جیۆدێتیك (کورتترین هێڵ لەسەر رووی زەمین) نەخشە (رووپێوەکان) کە تەواو بن بەڵام بڵاو نەکرابنەوە و زانیاری دەربارەی گۆڕانی ڕێڕەوە ئاویە سنورییەکان ، ئەو نەخشە و زانیاری و جیۆدێتیك و مەسحانەی لەناو قەڵەمڕەوی موڵکیەتی دەسەڵاتدارانی تورکن ، بگرە ئەگەر بڵاویش نەکرابنەوە دەبێ لەماوەی سی ڕۆژ لە جێبەجێ کردنی ئەم پەیماننامەی ئێستا بدرێنە نوێنەری کۆمسیۆنەکان لە ئەستەمبول کە بۆی هەیە لەلایەن هێزە هاوپەیمانە بنەڕەتییەکان دابمەزرێت .

هەروەها دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان دەست دەکەن بە فەرمان دان بە دەسەڵاتە خۆجێییەکان کە هەموو بەڵگەنامەکان بگەیەننە کۆمسیۆنەکان بەتایبەتی پلان و تۆمارەکانی زەوی و لەکاتی داواکردن هەموو وردەکارییەکان دەربارەی مومتەلەکات و باری ئابوری کە هەیە و زانیاری پێویستی تر بدەنە کۆمسیۆنەکان.

## ماددەی ٣٢

هەموو دەوڵەتە جیاجیاکانی خاوەن بەرژەوەندەیەکان دەست دەکەن بەپێدانی کە هەموو یارمەتییەك کۆمسیۆنەکانی کێشانی سنور ، جا ڕاستەوخۆ بێ یان بە ڕێگەی دەسەڵاتدارە خۆجێیەکان لە هەموو شتێك کە پەیوەندی هەبێت بە گواستنەوە و نیشتەجێ بوون و کار و شتەکان (تابلۆی ڕێنیشاندان و دینگەسنور)ی پێویست بۆ تەواو کردنی ئەو کارەی پێیان سپێردراوە ، بەتایبەتی حکومەتی تورکیای ئەستەمبول

دەستەبەر کردنی ستافی تەکنیکی بۆ هێزە هاوپەیمانە بنەڕەتییەکانی کورد لە ئەستۆی خۆی دەگرێ ، ئەگەر کۆمسیۆنەکانی سنور داوایان کرد و پێویستتیان پێبوو بۆ ئەوەی ئەو کارەی پێیان سپێردراوە تەواوی بکەن.

## ماددەی ٣٣

هەموو ئەو دەوڵەتانەی خاوەن بەرژەوەندین دەستەبەری پاراستنی خاڵە سێیەکان و نیشانەکان و تابلۆکان یان نیشانەکانی سنور دەبن کە لەلایەن کۆمسیۆنەکان قیت دەکرێنەوە.

## مادەی ٣٤

دینگەکان وا دادەنرێن بۆ ئەوەی لە هەردوولا ببینرێ ، ژمارەیان لەسەر دادەنرێت و شوێنەکانیان و ژمارەکانیان لەبەر بەڵگەنامەی نەخشەکان دیاردەکرێن.

## ماددەی ٣٥

ئەو پرۆتۆکۆلانەی کە باسی سنور و نەخشەکان و بەڵگەنامەکانی کە هاوپێچ کراون دەکەن ، بەسێ دانە دەکرێن کە دوانیان پێشکەش دەکرێن بە حکومەتەکانی هاوسنور و سێیەمیان بە حکومەتی کۆماری فەڕەنسا کە دانە ئەسڵیەکان دەداتە دەست ئەو هێزانەی کە ئەم پەیماننامەیەی ئێستا مۆر دەکەن.

**بەشی (٣)**

# دەقە سیاسییەکان

**بەشی یەکەم :**

# قوستەنتینیە ( ئەستەمبۆل )

## مادەی ٣٦

بەپێی مەرجەکانی دەقەکانی ئەم بەیاننامەی ئێستا ، لایەنە واژۆکەرە باڵاکان ئەوە پەسند دەکەن کە مافەکان و ناوی حکومەتی تورکی بەسەر قوستەنتینیە هیچ کاری تێ ناکا ، حکومەتی ناوبراو خاوەن شکۆ سوڵتان دەسەڵاتی لەوێ دەبێ و سەرۆکایەتی ئەوێ دەکا و ئەو دەتوانێ وەك پایتەختی دەوڵەتی تورکیا بیهێڵێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ، لە حاڵەتێك توركیا پێگیری نەكرد ، بە چاودێری كردنی بێ فرۆفێڵانەی دەقەكانی ئەم پەیماننامە و یان هەر پەیماننامەیەك و پەیمانێكی تری پاشكۆ بێ بە دڵسۆزی ، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە پاراستنی مافەكانی كەمایەتییە رەگەزی (عرقی) و ئایینی و زمانەكان ، ئەوا بەراشكاوی هێزە هاوپەیمانەكان مافیان بەدەست دەبێ كە دەقەكانی سەرەوە دەستكاری بكەن و لەسەر ئەو بنەمایە دەبێ توركیا رازی بێت بە هەر دەسكارییەك كە پەیوەندی بەمەوە هەبێت ، دەبێت پەسندی بكات.

**بەشی دووەم :**

# گەروەكان

## ماددەی ٣٧

گەشتی دەریایی لە گەروەكاندا ، كە گەروەكانی دەردەنیل و دەریای مەرمەرە و بۆسفۆر دەگرێتەوە ، هاتوچۆی دەریایی و ئاسمانی كراوە دەبێ لە داهاتودا لە هەردو حاڵەتی ئاشتی و جەنگ بۆ هەموو كەشتییەكی بازرگانی و جەنگی و هەموو فڕۆكەیەكی سەربازی و بازرگانی ، بەبێ جیاوازی ئاڵاكان.

ئەم ئاوانە نە دەكەونە ژێر مەرجی گەمارۆدان و نە هیچ مافێكی شەڕكردنی یان لێ بەكاردێ و نە هیچ كارێكی دوژمنكارانەیان لەناو ئەنجام دەدرێ ، تەنها ئەگەر بەپێی بڕیارێكی ئەنجومەنی كۆمەڵەی نەتەوەكان بێت.

## مادەی ٣٨

حكومەتی توركیا دان بەوەدا دەنێ كە پێویست دەكا هەنگاوی زیاتر بنرێت بۆ دابینكردنی ئازادی هاتوچۆی دەریایی و ئاسمانی كە لە مادەی ٣٧ هاتوە و لەسەر ئەو بنەمایە و بەپێی ئەوەی پەیوەندی هەبێت ، نوێنەر دەنێرێنە كۆمسیۆن كە پێی دەوترێت "كمسیۆنی گەروەكان" و دواتر وەك "كۆمسیۆنەكە" ئاماژەی پێ دەكرێ ، بە كۆنترۆڵی رێگە ئاوییەكان لە ماددەی ٣٩ دیاركراوە.

ئەوەی پەیوەندی پێیەوە هەبێت ، حكومەتی یۆنان هەمان دەسەڵات دەداتە كۆمسیۆنەكە و ئەوەش دەخاتە ئەستۆی خۆی كە هەمان ئاسانكاریەكە لە هەموو

لایەنێکەوە پێ بدات ، ئەم جۆرە کۆنترۆل کردنە جێبەجێ دەکرێت بەناوی حکومەتی توركیا و یۆنان و بەشێوەیەك کە لەم بەشە هاتوە.

## مادەی ٣٩

دەسەڵاتی ئەم کومسیۆنە فراوان دەبێت هەتا هەموو ئەو ئاوانەی کە لەنێوان ڕێژگەی دەردەنیلی دەریای سپی ناوەڕاست و ڕێژگەی بسفۆری دەریای ڕەش دەگرێتەوە ، هەروەها دەسەڵاتەکە ئەو ئاوانەش دەگرێتەوە کە دەکەونە نێوان سێ میلی ئەم ڕێژگانە ، بۆی هەیە دەسەڵاتەکە لەسەر کەناری دەریاکان پەیڕەو بکرێت و بەو فراوانیەی کە لەوانەیە پێویست بێت بۆ جێبەجێ کردنی دەقەکانی ئەم بەشە.

## ماددەی ٤٠

کۆمسیۆنەکە لەو نوێنەرانە پێك دێت کە دادەمەزرێن لەلایەن وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا (ئەگەر ئەوکاتەی ئە م حکومەتە ئارەزوی بەشداری کردنی هەبێ) و ئیمبراتۆریەتی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا و یابان و روسیا (ئەگەر ئەوکاتەی روسیا ببێتە ئەندامێکی کۆمەڵەی نەتەوەکان) و یۆنان و ڕۆمانیا و بولگاریا و تورکیا (ئەگەر و ئەوکاتەی ئەم دو دەوڵەتەی دوایی ببنە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان) ، هەر هێزێك یەك نوێنەر دادەمەزرێنێ و هەریەکە لە نوێنەرانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و ئیمبراتۆریەتی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا و یابان و روسیا دوو دەنگیان دەبێ نوێنەرانی هەریەکە لە یۆنان و ڕۆمانیا و بولگاریا و تورکیا یەك دەنگیان دەبێ ، هەر کۆمسیارێك دەکرێ لاببرێت تەنها لەلایەن ئەو حکومەتەی کە دایمەزراندوە.

## ماددەی ٤١

کۆمسیۆنەکان لە چوارچێوەی سنوری دیاریکراویان لە ماددەی ٣٩ ئیمتیازی دیبلۆماسی و حەسانەیان هەیە.

## ماددەی ٤٢

کۆمسیۆنەکە ئەم دەسەڵاتە بەکاردێنێ کە بەپێی ئەم پەیماننامەیە ئێستا پێی بەخشراوە کە سەربەخۆیی تەواوی لە دەسەڵاتی خۆجێیەتی دەبێت ، ئاڵای خۆی و بودجەی خۆی و ڕێکخراوەی جیای خۆی دەبێت.

## ماددەی ٤٣

لەچوارچێوەی سنوری مافی حوکم کردن هەروەك لە ماددەی ٣٩ هاتوە کۆمسیۆنەکە ئەم ئەرکانەی خوارەوەی پێ دەسپێردرێ:

أ- جێبەجێ کردنی هەر کارێك کە بە پێویستی دەزانرێ بۆ باشکردنی کەناڵەکان یان ئەو رێگایانەی دەچنە بەندەرەکان.

ب- روناککردنەوە و لابردنی ئەو تەنانەی سەرئاو دەکەون لە کەناڵەکان.

ج- کۆنترۆڵکردنی رێبەری دەریاوانی و پاپۆڕ (بەلەم) راکێشان.

د- کۆنترۆڵ کردنی لەنگەر خستنەوە.

هـ- کۆنترۆڵکردنێکی پێویست بۆ دڵنیابوون لە جێبەجێ کردنی سیستەمەکە لە بەندەرەکانی قوستەنتینیە و حەیدەر پاشا ، ئەو سیستەمەی فەرمانی جێبەجێ کردنی دراوە لە ماددەکانی ٣٣٥ هەتا ٣٤٤ بەشی یانزە.

(بەندەرەکان ، رێگە ئاویەکان، هێڵی ئاسن) لەم پەیماننامەی ئێستا

و- کۆنترۆڵکردنی ئەو بابەتانەی (مەسەلانەی) پەیوەندییان بە تێکشکانی کەشتی و رزگارکردنیان هەیە.

س- کۆنترۆڵکردنی کاری بارکردن و بەتاڵکردنی کەشتی بەهۆی بەلەم ، (ئەو کەشتیانەی ناگەنە شۆستەکان).

## ماددەی ٤٤

ئەگەر لە حاڵەتێك کۆمسیۆنەکە بینی دەست تێوەردان لە ئازادی تێپەڕبوون هەیە ئەوا ئەوە لە ئەستەمبول ، نوێنەرانی هێزە هاوپەیمانەکان کە هێزی داگیرکار پێشکەش دەکەن ، رادەگەیەنێ هەروەك لە ماددەی ١٧٨ داهاتووە ، ئەوکات ئەم نوێنەرانە هەماهەنگی لەگەڵ فەرماندە سەربازی و دەریاییەکانی ئەو هێزانەی کە ئاماژەیان پێکرا دەکەن ، بۆی هەیە ئەم جۆرە هەنگاوانە بەپێوست بزانرێت بۆ پاراستنی ئازادی گەورەکان ، کاری وا ئەنجام دەدرێ لەلایەن نوێنەرە ئاماژە پێکراوەکان لە حاڵەتی هەر کارێکی (دەرەکی) هەڕەشە لە ئازادی تێپەڕبوون بکات لە گەورەکان.

## ماددەی ٤٥

بەمەبەستی بەدەستهێنانی مومتەلەکات یان ئەنجامدانی هەر کارێکی گرنگ کە پێویست بکات ، کۆمسیۆنەکە دەسەڵاتی پێدراوە ئەو جۆرە قەرزانەی ببەخشێ بۆی هەیە بە پێویستی بزانێ ، بەپێێ توانا ئەم قەرزانە بەو باجە گومرگییانە دەستەبەر دەکرێن کە دەسەپێنرێنە سەر ئەو پاپۆڕانەی ئەو گەروانە بەکاردێنن ، هەروەك لە ماددەی ٥٣ داهاتوە.

## ماددەی ٤٦

ئەو کارانەی کە پێشتر ئەنجام دەدران لەلایەن ئەنجومەنی باڵای تەندروستی ئەستەمبول و ئیدارەی تەندروستی تورکی کە ئەویش لەلایەن ئەنجومەنی ناوبراو بەڕێوە دەبرا ، ئەو کارانەی کە لەلایەن بەشی بەلەمی فریاکەوتنی نیشتمانی بسفۆرەوە جێبەجێ دەکرا لەناو ئەو چوارچێوەی کە لەماددەی ٣٩ دیارکراوە ، لەژێر کۆنترۆڵی کۆمسیۆنەکە رێی کارکردنیان پێ دەدرێ و دەکرێ بە رێگەیەکی وا ئاراستە بکرێت.

کۆمسیۆنەکە هاوکاری لە جێبەجێ کردنی هەر سیاسەتێکی گشتی دەکات کە لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکان پەیڕەو دەکرێ بۆ رێگرتن لە بڵاوبونەوەی نەخۆشی و قەڵاچۆکردنی نەخۆشی.

## ماددەی ٤٧

بەپێی ئەو دەسەڵاتە گشتییەی کۆنترۆڵ کردن کە بە کۆمسیۆنەکە دراوە ، مافی هەرکەسێك یان کۆمپانیایەك کە ئێستا مۆڵەتی (ئیمتیازی) پەیوەندیداری بە فەنارەکان (منارە یان تاوەری رێنمایی پاپۆڕ) و شۆستەکانی بەندەر و لەنگەرخستن و ئەو جۆرە مەسەلانە هەیە ، پارێزگاری لێ دەکرێت ، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی گشتی ، کۆمسیۆنەکە ئەو دەسەڵاتەی هەیە ئەگەر وای زانی پێویست دەکا ئەم مافانە بکڕێتەوە یان دەستکارییان بکات بەپێی ئەو مەرجانەی کە لە ماددەی ٣١١ ی بەشی (٩) (دەقە ئابوورییەکان)ی ئەم پەیماننامەیە هەیە ، یاخود مۆڵەتێك (ئیمتیازێك)ی نوێ وەربگرێ.

## ماددەی ٤٨

بۆ ئاسانکاری کردنی جێبەجێ کردنی ئەو کارانەی بەپێی ئەم بەشە سپێرراوە ، کۆمسیۆنەکە دەسەڵاتی ئەوەی دەبێ کە هێزێکی پۆلیسی تایبەت رێکبخات ئەگەر بەپێویستی زانی ، بەپێی توانا ئەم هێزە لە دانیشتوانی زگماکی ناوچەی گەورەکان و دورگەکانی ئاماژەپێکراو لە ماددەی ١٧٨ بەشی (٥) (دەقە سەربازی و دەریاوانی و ئاسمانی) دەبن ، ئەمە خەڵکی دورگەکانی ئیمنۆس و ئیمبرۆس و سامۆسراس و تێنەدۆس و میتیلین ناگرێتەوە ، ئەفسەری پۆلیسی بیانی کە لەلایەن کۆمسیۆنەکە دادەمەزرێن فەرماندەیی هێزی ناوبراو دەکەن.

## ماددەی ٤٩

لەو بەشەی کە ناوچەی گەروەکانە ، کە دورگەکانی دەریای مەرمەرە دەگرێتەوە ، ئەو دورگانەی کە وەك بەشێکی تورکیا دەمێننەوە ، هەتا کاتی چاکسازی سیستەمی دادوەری تورکیا کە لە ماددەی ١٣٦ داهاتوە دەکرێت هەموو ئەو سەرپێچیانەی دوای رێنمایی و یاسا خۆجێییەکان کە لەلایەن کۆمسیۆنەکە دانراون ، هاوڵاتییەکانی هێزەکانی براوە ئەنجامی دەدەن ، ئەوە بەپێی دادگاکانی کونسولگەری هێزەکانی ناوبراو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت ، هێزە هاوپەیمانەکان ئەوە پەسنددەکەن کە ئەم جۆرە سەرپێچییانە دادوەرانە لەبەردەم دادگاکانی دەسەڵاتی کونسولخانەکان یان خودی دەسەڵاتدارەکان دادگایی بکرێن. بەڵام ئەم سەرپێچییانەی هاوڵاتی تورکی یان هاوڵاتیانی تر جگە لە هاوڵاتیانی براوەکان ئەنجامی دەدەن لەلایەن دەسەڵاتدارانی دادوەری پسپۆڕی تورکی چارەسەر دەکرێن.

لەوبەشەی ناوچەی ناوبراو کە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەروەری یۆنان ئەم جۆرە سە رپێچییانە لەلایەن دەسەڵاتی دادوەری یۆنانی پسپۆڕ چارەسەر دەکرێت.

## ماددەی ٥٠

ئەفسەران یان ئەندامانی هەر گەمییەکی (پاپۆڕێکی) بازرگانی چوارچێوەی سنوری دادوەری کۆمسیۆنەکە کە لەوانەیە بە هەر تاوانێك لە کەنار دەریا دەستگیر بکرێت چ

لەسەر کەناربێت یان لەنا و دەریا بەگوێرەی دەسەڵاتی دادوەری ناوبراو ، ئەوا پۆلیسی کۆمسیۆن بۆی هەیە بیهێنێتە بەردەم دەسەڵاتی دادوەوری پسپۆڕ ، ئەگەر تاوانبارەکە بە رێگەیەکی تر گیرا ئەوا دەستبەجێ دەبێ بدرێتە دەست پۆلیسی کۆمسیۆنەکە.

## مادەی ٥١

کۆمسیۆنەکە ئەفسەر یان فەرمانبەرانی فەرمان پێدراوی (لاوەکی) وەها دادەمەزرێنێ کە بۆی هەیە پێویستی پێیان هەبێت لە یارمەتیدانی لە جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکانەی پێی سپێردراوە.

## مادەی ٥٢

لە هەموو ئەو مەسەلە دەریاوانیانەی پەیوەندییان بەو ئاوانەی چوارچێوەی سنوری دادوەری کۆمسیۆنەکەوە هەیە ، ئەوە بەگوێرەی بەندەکانی ماددەی ٣٧ هەموو کەمییەکان بە یەکسانییەکی رەها مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

## ماددەی ٥٣

بەپێی ئەوەی لە ماددەی ٤٧ هاتووە ، ئەو مافانەی ئێستا کە بەپێی ئەو باج بۆ مەبەستی جیاجیا ، چ راستەوخۆ لەلایەن حکومەتی تورکیا یان لەلایەن دەستە نێودەوڵەتیەکان یان لەلایەن کۆمپانیا تایبەتیەکان، لە چوارچێوەی سنوری دادوەری کۆمسیۆنەکە بە گەمی و بار وەردەگیرێت ، دەگوازرێتەوە بۆ کۆمسیۆنەکە کۆمسیۆنەکەش ئەو باج و پارە وەرگیراوانە بە بڕەپارەی وا جێگیردەکا کە تەنها بۆی هەبێ بەشێوەیەکی مەعقول بەشی بکا بۆ خە رجی ئەو کارانەی کە جێبەجێیان دەکا بۆ ئەو خزمەتانەی پێشکەش بە گەمیەوانی دەکات ، ئەمەش ئەو خەرجییە گشتیەی بەڕێوەبردنی کۆمسیۆنەکە و هەروەها ئەو موچە و پارە دانانەی کە لە پەرەگرافی ٣ ی پاشکۆی ئەم بەشە ناسەرەکیەدا هاتوە دەگرێتەوە.

بۆ ئەم مەبەستانە و تەنها بە رەزامەندی پێشوەختی ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان ، بێجگە لەوانەی ئێستا هەن کۆمسیۆنەکە بۆی هەیە باج و پارە وەرگرتنی تر دابنێ و بڕەکانیشی جێگیر بکات.

## ماددەی ٥٤

هەموو باج و پارە وەرگیراوانەی کە لەلایەن کۆمسیۆنەکە سەپێنراون ، بەبێ هیچ جیاوازییەك و لە سەر بنەمای یەکسانی تەواو لەنێوان هەموو گەمیەکان وەردەگیرێن ، جا لە هەر بەندەرێکەوە هاتبن و شوێنی مەبەستی یان هەر کوێیەك بێ و بۆ هەر کوێیەك بچن و هەر ئاڵایەکیان هەڵگردبێ و خاوەنەکانیان هەرکێ بێت و رەگەزنامەی هەر کوێیان هەبێ و هەر کێیەك خاوەنی بارەکە بن.

ئەم رێکخستنکاریە کارناکاتە سەر مافی کۆمسیۆنەکە لە جێگیرکردنی ئەو باجە گومرکیانە بەپێی کێشیان بە تەن وەك لەلایەن ئەم بەشە ناسەرەکیەداهاتووە.

## ماددەی ٥٥

حکومەتەکانی تورکیا و یۆنان ئەو ئاسانکاریانە دەستەبەر دەکەن کە بەهۆیەوە کۆمسیۆنەکە ببێتە خاوەنی ئەو زەوی و بینایانەی کە بە پێویستی بزانێ هەیبێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکانەی پێی سپێرراوە بەشێوەیەکی کاریگەرییانە.

## ماددەی ٥٦

کەشتییە جەنگیەکان کە بە ئەو ئاوانەدا تێدەپەڕن کە لە ماددەی ٣٩ دیارکراوە ، لە هەموو لایەنێکەوە ملکەچی ئەو رێنماییانە دەبن کە لەلایەن کۆمسیۆنەکە دەردەچێ لەلایەنی جێبەجێ کردنی یاسای ئاسایی دەریاوانی و پێداویستییە تەندروستییەکان.

## ماددەی ٥٧

١- گەمیە (کەشتیە) جەنگیەکان نە دەکرێ هیچ وەرگرن و نە بمێننەوەو تەنها ئەگەر زۆر پێویست بێ بۆ ئەوەی تێپەڕبونیان بە گەورەکاندا تەواو بکەن و بگەنە نزیکترین بەندەر کە بۆی دەچن و نە دەکرێ ئیمدادات یان ماددە جەنگییەکان یان سەربازیەکان تەواوکەن یان دەستەی کەشتیوانی تەواوکەن ، لە سنوری ئەو ئاوانەی

کە لەژێر کۆنترۆڵی کۆمسیۆنەکەیە ، تەنها بایی ئەوەندەیان بۆ چاك بکرێتەوە ، کە بە تەواوی پێویست بێ کە کەشتییەکان بگەڕێنەوە بارێکی گونجاو بۆ بەردەوامی گەشتەکەیان و بەهیچ شێوەیەك ناکرێ هیچ شتێك بدەنە هێزە جەنگییەکانیان.

کۆمسیۆنەکە بڕیار دەدا کە چ چاکردنەوەیەی پێویستە و ئەمانەش دەبێ بەپێی توانا بە کەمترین دواکەوتن ئەنجام بدرێت. (بەزوترین کات ئەنجام بدرێت).

٢- تێپەڕبونی گەمیە جەنگیەکان بەناو ئەو ئاوانەدا کە لەژێر کۆنترۆڵی کۆمسیۆنەکەدایە دەبێ بەپێی توانا بە کەمترین دواکەوتن مەیسەر بێت ، هەروەها نابێ هیچ ڕێگرتنێك هەبێ ، مەگەر بۆ تێکەڵکردنی خزمەتگوزارییە پێویستیەکان بێ.

٣- مانەوەی کەشتییە جەنگیەکان لە بەندەرەکانی ناو سنوری دادوەری کۆمسیۆنەکە نابێ لە ٢٤ کاتژمێر تێپەڕێ تەنها لە حاڵەتی لێقەومان نەبێ ، لەم جۆرە حاڵەتەدا دەبێ پابەندەی ئەوە بن کە بەزوترین کات بڕۆن ، ئەم مانەوەیە دەبێ ٢٤ کاتژمێر زیاتر نەخایەنێت ، ئەم ماوەیەش دەکاتە ڕۆشتنی گەمیەکی لایەنی جەنگی لە ئاوەکانی ژێر کۆنترۆڵی کۆمسیۆنەکەوە و بەڕێکەوتنی (ڕۆیشتنی) گەمییەك کە سەر بە لایەنێکی جەنگی بەرامبەرە.

٤- ڕێنمایی زیاتر لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکان دادەنرێت ، ئەو ڕێنماییانەی لەکاتی جنگ کاردەکا لە ئاوەکانی ژێر کۆنترۆڵی کۆمسیۆنەکە ، پەیوەست بێت بەتایبەتی بە تێپەڕبوونی کەلوپەلی جەنگ و قاچاغچیاتی بە ئاراستەی دوژمنانی تورکیا ، یان بە دوبارە تەمویل کردنەوەو وەرگرتن لە داواکراو(خەزنکراو) و چاککردنەوە لە ئاوە ناوبراوەکاندا.

## ماددەی ٥٨

دەستکەوتەکان (پاپۆڕ یان باری پاپۆڕ..) دەکەونە ژێر هەمان مەرجەکانی کەشتیە بچوکە جەنگیەکان لە هەموو لایەنێکەوە.

## ماددەی ٥٩

هیچ لایەنێکی جەنگ بۆی نیە تیپە سەربازییەکان و تەقەمەنی جەنگ یان کەلوپەلە جەنگیەکان لە ئاوەکانی ژێر کۆنترۆڵی کۆمسیۆنەکە هەڵگرێت یان دابکرێت ، تەنها لەو

حاڵەتـە نـەبێ كـە بەرێكـەوت كۆسـپەیەك ببێتـە سـەر ڕێـی تێپەڕبونەكـە و لـەم جـۆرە حاڵەتانەشدا ، تێپەڕ بونەكە بەردەوامیە ئاساییەكەی خۆی وەردەگرێتەوە.

## ماددەی ٦٠

هیچ شتێك لە ماددەكانی ٥٧ یان ٥٨ یان ٥٩ دانیـە وا دابنرێـت كـە دەسـەڵاتەكانی لایەنێك یـان لایەنـەكانی جـەنگ كـە بـەپێی بڕیـاری ئەنجومـەنی كۆمەڵـەی نەتـەوەكان كاردەكەن سنوردار بكات.

## ماددەی ٦١

هەر ناكۆكییەك سەرهەڵبدا لەنێوان هێزەكان لەروی لێكدانەوە یان جێبەجێ كردنـی بڕگەكانی ئەم بەشە ، ئەوەندەی پەیوەندی بە ئەستەنبول و حەیدەر پاشاوە هەبێت ، بڕگـەكانی ماددەكـانی ٣٣٥ هـەتا ٣٤٤ ، بەشـی ١١ (بەنـدەرەكان و ڕێگـە ئاویـەكان و هێڵەكانی ئاسن) ، دەبێ ئـەو ناكۆكییـە ڕەوانـەی كۆمـسیۆنەكە بكرێـت ، لـە حاڵـەتێك ئەگەر بڕیاری كۆمسیۆنەكە لەلایەن هەر هێزێك پەسند نەكرا پرسەكە لەسـەر داواكـاری هێـزە پەیوەندیدارەكـە ، ئـەوە بـەو دەسـەڵاتەی بـە كۆمەڵـەی گەلانـەوە دراوە یـەكلا دەكرێتەوە لـەو ماوەیـەدا كۆمـسیۆنەكە هەڵدەستێ بـە جێبـەجێ كردنـی ئـەو بڕیـارە یەكلاكەرەوەی كۆمەڵەی گەلان.

# پاشكۆ:

١- دەبێ سەرۆكایەتی كۆمسیۆنی گەروەكان بەنۆبەت (بەنۆرە) لەنێوان ئەنـدامانی كۆمسیۆنەكەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ دەبێ ، هەر ئەندامەو مافی دوو دەنگی دەبێ.

كۆمـسیۆنەكە بڕیارەكـانی بـە زۆرینـەی دەنـگ دەدات و سـەرۆكیش دەنگـی یەكلاكەرەوەی دەبێ ، دەبـێ دەنگنـەدان وەك دەنگـدانێكی دژ بـە (تاوتوێلەسـەركەر) دابنرێت.

هەموو ئەندامێكی كۆمسیۆن مـافی دانـانی جێگـری ئەنـدامی كۆمـسیۆنی دەبـێ بـۆ ئەوەی لەكاتی ئامادەنەبونی خۆی جێی بگرێتەوە.

٢- موچەی هەر ئەندامێکی کۆمسیۆنەکە لەلایەن ئەو حکومەتەوە دەدرێ کە دایمەزراندوە ماوەماوە لەسەر جێگیرکردنی موچەکان وەك برێکی مەعقول ، ئەو حکومەتانەی کە نوێنەریان لە کۆمسیۆنەکە هەیە لەنێوان خۆیان رێك دەکەون.

٣- دەبێ موچەی ئەو ئەفسەرە پۆلیسانەی کە لە ماددەی ٤٨ ئاماژەیان پێکراوەو هی ئەو ئەفسەر و فەرمانبەرانەی تر کە دەکرێ بەپێی ماددەی ٥١ دابمەزرێن ، هەروەها پارەدانی پۆلیسی خۆجێیەتی کە لە ماددەی ٤٨ ئاماژەی پێکراوە ، دەبێ لەو پارانە بدرێ ن کە وەك باجی گومرکی و تێچون لە کەشتیەوانی وەردەگیرێن.

دەبێ کۆمسیۆنەکە چوارچێوەیەکی رێنمایی بۆ مەرجەکانی دامەزراندنی ئەفسەران و فەرمانبەران دابنێ.

٤- دەبێ کۆمسیۆنەکە چەند بەلەمێکی گەورە لەژێر دەستی خۆی دابنێ بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی هەروەك لەم بەشە ناسەرەکیە و لەم پاشکۆیەدا هاتوە.

٥- بۆ جێبەجێ کردنی ئەو هەموو کارانەی کە پێی سپێرراوە ، بەپێی دەقەکانی ئەم بەشە ناسەرەکیە و ئەم پاشکۆیە وە لەناو ئەو چوارچێوەی کە تیایدا دیارکراوە کۆمسیۆنەکە دەسەڵاتی ئامادەکردن و دەرکردن و جێبەجێ کردنی رێنمایی پێویستی هەیە ، ئەم دەسەڵاتە مافی دەستکاری کردنی بەپێی پێویستی ئەو رێنماییانەی ئێستای هەیە ، هەروەها دەستەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەو رێنماییانەی هەیە.

٦- دەبێ کۆمسیۆنەکە چوارچێوەیەکی رێنمایی دابنێ بۆ چۆنیەتی راگرتنی ژمێرکاری ئەو هەموو داهات و خەرجیانەی ئەو پارەیەی کە لەژێردەسەڵاتی دایە ، هەروەها بۆ وردبینی ئەو ژمێرکاریانە و بڵاوکردنەوەی ، هەروەها لەسەریەتی ساڵانە راپۆرتێك دەربارەی ئەو هەموو داهات و خەرجییانە پێشکەش بکات.

## بەشی سێیەم: کوردستان

### ماددەی (٦٢):

لیژنەیەکی سێ قۆڵی پێك دێت بارەگاکەی لە ئەستەمبۆل دەبێت ، ئەو لیژنەیە لەلایەن بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و نوێنەری کورد دروست دەکرێت بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەکی دەڤەری بۆ ناوچە کوردییەکان لەدوای شەش

مانگ لە مۆركردنی ئەو پەیماننامەیە ، سنوری ئەو ناوچەیەش بریتییە لە رۆژهەلاتی فورات ، و خواروی سنوری ئەرمینیا كە لەدوای ئەوەش دیاری دەكرێ ، لە سەروی سنوری توركیا و سوریا و میزۆپۆتامیا كە لە پەرەگرافی (٢)ی ماددەی (٢٧) دەستنیشان كراوە ، ئەگەر لەكاتێكیشا ئەو لیژنەیە لە هەر مەسەلەیەك نەگەیشتنە ئەنجامێك ئەوا هەریەكە راپۆرتی خۆی لەو مەسەلەیە دەداتەوە حكومەتەكەی ، لەو پرۆژەیەدا پێویستە رەچاوی تەواوی مافەكانی رەگەزی و ئایینی كلدان و شارور و كەمایەتییەكانی تر بكرێت لەنێو ئەو سنورەی لە سەروو دیاریكرا ، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەیەكی تری پێكهاتوو لە بەریتانی و فەرەنسی و ئیتالی و فارسی و كوردی سەردانی مەیدانی دەكەن بۆ هەر دەستكارییەك ئەگەر پێویست بكات لە سنورەكانی توركیا ، لەبەر ئەوەی ئەو سنورە لەژێر مەرجەكانی ئەو پەیماننامەیە تا سنوری فارس.

## مادده (٦٣):

لەوساتەوە حكومەتی توركی پەیمان دەدا بە قایلبوونی بەو بڕیارانە كە لە هەردوو لیژنەی ئاماژەپێكراو لەماددەی (٦٢) هاتووە وا لە ماوەی (٣) مانگیش جێبەجێی دەكا ، لە دوای جاڕدانی ماددەی (٦٤) لەدوای سالێكی تر ئەگەر زۆربەی گەلی كورد كە لەو سنورەی لە ماددەی (٦٢) دیاریكرا داوای (سەربەخۆییان لە كۆمەلەی نەتەوەكان (عصبە الامم) كردو لە توركیا جیاببنەوە ، كۆمەلەی نەتەوەكانیش زانییان ئەوانە دەتوانن ئەو سەربەخۆییە بەڕێوە ببەن و پێشی دان ، ئەوان دەبێت توركیا دانیان پێدا بێنێ و لە هەموو مافەكانی خۆی لەو ناوچانە دەستهەلگرێ ، وردەكاری ئەو دەستهەلگرتنەش بابەتی رێكەوتنێكی تایبەتی دەبێ لەنێوان ولاتە هەرەگرنگەكانی هاوپەیمانان و توركیا ، ئەوكاتەش هێزە سەرەكیەكانی هاوپەیمانان هیچ رێگرییەك ناكا لە تێكەلبونێكی ئارەزومەندانەی ئەو بەشە كوردستانەی لە ویلایەتی موسلە بۆ ئەو دەولەتە كوردیە سەربەخۆیەی دروست دەبێ.

## بەشی چوارەم :

# سمیرنا

## مادده (٦٥):

حوکمی ئەو بەشە (بەشی سێیەم–مترجم) بەسەر شاری سمیرنا و دەوروبەری کە لە ماددەی (٦٦) دیاری دەکرێت ، تا ئەوکاتەی سنورەکە تەواو دەستنیشان دەکری بەپێی ماددەی (٨٣).

## مادده (٦٦):

تایبەتە بە دیاریکردنی ئەو ناوچەیەی پێی وترا (سمیرنا) * (ئەزمیری ئێستا–م) لە ماددەی (٦٥).

## مادده (٦٧):

لەدوای ئەو بەرواره بە (١٥) رۆژ لیژنەیەك لە (بەریتانی و ئیتالی و فەرەنسی) و ئەندامێک ی یۆنانی و یەکێکی تورکی پێکدێت بۆ دواداچوونی ماددەی (٦٦).

## مادده (٦٨):

بۆ جیاکردنەوەی سەمیرنا و دەوروبەری کە لە ماددەی (٦٦) هاتووه ، هەروەها جیاکردنەوەی ئەو شوێنانەی لە تورکیا.

## مادده (٦٩)

هەر تایبەتە بە سەمیرنا.

## مادده (٧٠):

بەرپرسیاریەتی سەمیرنا بە یۆنان دەسپێرێ.

## مادده (٧١):

رێ دەدا بە یۆنان هێزی عەسکەری بهێنێتە سمیرنا بۆ پاراستنی ئاسایش.

## مادده (٧٢):

دوای (٦) مانگ پەرلەمان و دام و دەزگای تر لە ناوچەی سمیرنا هەلدەبژێردرێ بۆ نوێنەرایەتی کردنی پێکهاتە جیاجیاکان ، دوای لەلایەن خەڵکی ئەو ناوچەیەوە

بەزۆرینەی دەنگ چارەنوسیان بەلای یۆنان دیاری دەکرێت ، یۆنان دەتوانێ ئەو راپرسییە دوا بخا بۆ ماوەی ساڵێك بۆ ئەوەی تەواوی ئاوارەکان بگەڕێنەوە.

**ماددە (٧٣):**

پەیوەندی ئیدار ەی یۆنان و پەرلەمانی دەڤەری سمیرنا لەلایەن ئیدارەی سمیرنا دیاری دەکرێ بەپێی دەستوری یۆنانی.

**ماددە (٧٤):**

نابێ سەربازی زۆرەملێ بە سەر خەڵکی سمیرنا بسەپێنرێت تا خۆیان ساغ دەکەنەوە.

**ماددە (٧٥):**

ئەو رێنماییانەی لە مادەی (٨٦) دێت سەبارەت بە پاراستنی کەمایەتی رەگەزی و ئایینی لەسەر ناوچەی سەمیرناشی جێبەجێ دەبێت.

**ماددە (٧٦):**

حکومەتی یۆنان دەتوانێ سیستەمی باج لە کەنارەکانی سەمیرنا دابنێ.

**ماددە (٧٧):**

نابێ حکومەتی یۆنان جارێ دراوی تورکیا لەناوچەی سەمیرنا بەکەم وەربگرێ تا دەگەنە ئەنجام.

**ماددە (٧٨):**

رێنمایی و حوکمەکانی سەبارەت بە سیستەمی **هاتوچۆ** (ئاوی و وشکاوی و...) لە سەمیرناش جێبەجێ دەکرێ.

**ماددە (٧٩):**

سەبارەت بە ناسنامەی تاکەکەسیە لە سەمیرنا ، ئەو تورکانەی ئەوێ هەر بە تورکی دەمێننەوە بۆ پاراستنی ئەو مافەش یۆنان ئەو بەڵێنە دەدات.

**ماددە (٨٠):**

**هەندێ ئەحکامی داراییە بۆ سەمیرنا**

**ماددەی (٨١):**

نابێت هەتا دەرکردنی بڕیاری سەربەخۆبوون لە تورکیا، دەستکاری سیستەمەکانی (بيت المال)ی عوسمانی بکرێت لەم ناوچەی سەمیرنا کە پێکدێت لە زەکاتی دانەوێڵە و هەندێ جۆری باجی تر.

**مادده (٨٢):**

ڕێکەوتنەکانی داهاتوو بڕیار لەسەر ئەو گرفتانە دەدات کە لە ئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەو مادانەی سەروو پەیدا دەبن لە سمیرنا.

**ماددەی (٨٣):**

دوای پێنج ساڵ لە هەڵبژاردنی پەرلەمان بۆیان هەیە راپرسییەك ئەنجام بدەن و داوا لە (کۆمەڵەی نەتەوەکان) بکەن ، ئەو ناوچەیە بخەنە سەر یۆنان ، ئەگەر زۆرایەتی دەنگ ئەوەی ویست ، ئەوکاتی تورکیا دەبێ وازبهێنێ.

**بەشی پێنجەم :**

## یۆنان

**ماددەی (٨٤):**

بریتییە لە دیاری کردنی سنوری تورکیا و یۆنان.

**مادده (٨٥):**

پێکهێنانی لیژنەیەکی (٥) قۆڵی بە تورکی و یۆنانیشەوە لە مادەی (١٥) ڕۆژ بۆ دواداچونی ماددەی (٨٤).

**مادده (٨٦):**

تایبەتە بە هاتوچۆ و پارێزگاری لە کەمایەتی لەو ناوچانەی هەموارکردنی سنوری تورکیا و یۆنان دەیانگرێتەوە.

**مادده (٨٧):**

باس لە پابەندیە داراییەکان دەکاتەوە کە لە ئەنجامی ئەو هەموارکردنە دێتەدی.

**بەشی شەشەم :**

# ئەرمینیا

## مادەی (٨٨):

بە پێی ئەو كارانەی هاوپەیمانان پێی هەلساون توركیا دان بە ئەرمینیا دەنێت وەك دەولەتێكی سەربەخۆ .

## مادەی ٨٩:

توركیا و ئەرمینیا رێك دەكەون لەسەر ئەو سنورەی ویلایەتەكانی ئەرزەرۆم و ترابزون و وان و بەتلیس لایەنەكانی ئەو پەیماننامەیە و بەنێوبژی سەرۆكی ئەمریكا یان هەر جۆر چارەسەرییەكی بۆ ئەوەی سنوری ئەرمینیاش بگاتە دەریا ئەگەر زەمینی تری توركیاشی بەگەر كەوێ.

## مادده (٩٠):

لەكاتی دەستنیشانكردنی ئەو سنورەی كە لە ماددەی (٨٩) هاتووە ئەو ویلایەتانە (یان بەشێك لێی) بخرێتە سەر ئەرمینیا و لەو بەروارەش توركیا لێی دەكشێتەوە ، بە هەمان شێوە رێكەوتنەكانی سەبارەت بە پابەندی داراییەوە.

## مادەی ٩١:

لەكاتی بەشینەوەی هەر ناوچەیەك كە لە مادەی (٨٩) ئاماژەی پێكراوە بۆ ئەرمینیا ئەوە كۆمیسیۆنێكی سنور ، كە بڕیاری پێكهێنانی دوایی دەدرێ ، لەماوەی سێ مانگ پێكدێ لەكاتی وەرگرتنی بڕیارەكەوە كاری ئەو كۆمسیۆنە دیاركردنی سنوری نێوان ئەرمینیا و توركیا دەبێت.

## مادە (٩٢):

لەبارەی دیاریكردنی سنوری نێوان ئەرمینیا و جۆرجیا و ئازەربێجانە لەنێوخۆیان ، ئەگەر دیاریش نەكرا ئەو ە لەلایەن هێزە هاوپەیمانەكان دیاری دەكرێ.

## ماددەی ٩٣:

ئەرمینیا قایل دەبێ بە هەر جۆرە دەستكارییەك كە هاوپەیمانان پێی هەڵدەستن و بە پێویستی دەزانن بۆ پاراستنی ئەو هاولاتیانەی كە لەگەڵ زۆرایەتیەكەی خەڵكی ئەرمینیا لە رەگەز و ئایین و زمان جیان.

بە هەمان شێوەش پاراستنی ئازادی هاتوچۆ.

## بەشی حەوتەم :

# سوریا و میزۆپۆتامیاو فەلەستین

### ماددەی ٩٤:

هەریەکە لە سوریا و میزۆپۆتامیا و بەشێوەیەکی کاتی دەبنە وڵاتی سەربەخۆ بە پێی ماددەی (٢٢)ی بەشی یەکەمی (میساقی کۆمەلەی گەلان) دەکەونە ژێر راوێژی وڵاتانی ئینتداب کرا و بەسەریان هەتا ئەوکاتەی دەتوانن لەسەر پێی خۆیان بوەستن.

بۆ ئەو مەبەستەش لەدوای ١٥ رۆژی تر لێژنەیەکی سێ قۆڵی (بەریتانی، فەرەنسی، ئیتاڵی) و لە ئەندامێکی عوسمانیش پێك دەهێنرێت ، بۆ بەدواداچوونی ئەو سنورانەی لە ماددەی (٢٧) هاتوون بەجۆرێك بۆ دەستنیشانکردنی سنوری سوریا نوێنەرێکی ئەوان بەشدار دەبێت بۆ سنوری میزۆپۆتامیاش نوێنەرێکیان ئامادە دەبێت ، بڕیاردان لەسەر سنوری تری ئەو دەوڵەتانە و دیارکردنی و هەڵبژاردنی جۆری ئینتداب لە ئەستۆی هاوپەیمانە سەرەکیەکانی دەبێ.

### ماددەی (٩٥):

لایەنەکانی ئەو رێکەوتنە قایلن بە جێبەجێ کردنی ناوەرۆکەکانی ماددەی (٢٢) بۆ ئیدارەی فەلەستین لەژێر ئینتداب لە چوارچێوەی ئەو سنورەی هاوپەیمانان بۆی دیاری دەکەن ، ئینتدابکەر بەرپرسە لە ئەکتیڤ کردنی جاڕنامەی ١١/٢ ١٩١٧.* کە لەلایەن بەریتانیاوە دەرچوو و لایەنەکانی تری هاوپەیمانانیش گرتویانەتە بەر ، بۆ ئەوەی قەوارەیەکی نیشتمانی بۆ گەلی یەهودی لە فەلەستین دابمەزرێ ، دەبێ رونیش بێت هیچ شتێك رێگر نەبێ لە مافە ئایینی و مەدەنیەکانی غەیرە یەهود* هەروەك بەهودیەکان لە وڵاتی تر هەیانە.

* مەبەستی بەڵێنی بەلفۆرە.
* بەغەیرە بەهود وتراوە جویم

لایەنی ئینتداب بەڵێن دەدا بەخێرایی لێژنەیەك پێك بهێنن لەگەڵ سەرۆکێك کە لەلایەن (کۆمەڵەی گەلان) دیاری بکرێ بۆ ئەوەی لەو بەندە بکۆڵێتەوەو چی پێویستە بۆ چین و توێژە جیاجیاکانی بکرێ.

### ماددەی (٩٦):

ئەو مەرجانەی بۆ ئەو خاکەی سەروو دانرا لەلایەن هاوپەیمانان بەلایەنی کۆمەڵەی گەلان دەدرێ بۆ رازی بوون لەسەری.

### مادده (٩٧):

بەپێی مادەی (١٣٢) ی ئەو رێکەوتنە تورکیا قایل دەبێ بە هەموو ئەو بڕیارانەی کە لەو بەشە دەرچوە.

## بەشی هەشتەم :

# حیجاز

### ماددەی (٩٨):

بەپێی ئەو بەرنامەیەی هێزە هاوپەیمانەکان ، تورکیا دان بە حیجاز دەهێنێ وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ ، هەموو ئەو ئاسەوارانەی سەر بە عوسمانی لەسەر خاکی حیجاز دادەماڵرێ.

### ماددەی (٩٩):

لەبارەی گەڕانەوەی ئیش و کارەکانی شارە پیرۆزەکانی مەککە و مەدینە بۆ شای حیجاز گێڕدراوەتەوە کە پێشتر تایبەت بوو بە سوڵتان هەروەها ئاسانکردنی سەفەری حەج بۆ هەموو لایەك.

### ماددەی (١٠٠):

خاوەن شکۆ پادشای حیجاز بەڵێن دەدا کە کاروباری بازرگانی بە یەکسانی دابین بکا لەسەر خاکی خۆی بۆ هاوڵاتی و پاپۆڕەکانی وڵاتانی ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان.

## بەشی نۆیەم :

# میسر و سودان و قوبرس

### ماددەی (١٠١):

تورکیا وازدێنێ لە موڵکیەتی بەسەر میسردا.

### ماددە (١٠٢):

لەبارەی گۆڕینی ناسنامەی تاکە لە تورکیەوە بۆ میسری.

### ماددە (١٠٣):

سەبارەت بەوانەی میسری نین لەپێش ١٩١٤/١٢/١٨ لەمیسر دەژین ، بەلام دەسەلاتی بالای میسری مافی ئەوەی هەیە مافی نیشتەجێبوون بە هەندێ کەس نەدات! لە سەردەمی عوسمانی مافی نیشتەجێبوونیان هەیە.

### ماددە (١٠٤):

سەبارەت بە هەندێ رۆتینیاتی کەلوپەل و دابەشی میراتی عوسمانییە لە میسر.

### ماددەی (١٠٥):

دوای سالێك هاولاتی میسر ناسنامەی وەرگرن ، یان لە هەر ولاتێکی جیا بویەوە لە تورکیا.

### ماددە (١٠٦):

حکومەتی میسری ئازادییەکی تەواوی هەیە لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ رەعیەی تورکی و هەروەها پابەندە بەو مەرجانەی هەن بۆ خۆ دامەزراندنیان لە میسر.

### ماددە (١٠٧):

هاولاتی میسر لە دەرەوە مافی یاسایی لە کۆنسولیەکانی بەریتانیای هەیە بۆ پاراستنی.

### ماددەی (١٠٨):

ئەو کەلوپەلە میسرییە دێتە تورکیا دەبێ وەك بەریتانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ..

**ماددەی (١٠٩):**

سەربەستی هاتوچۆی دەریای دەکەوێتە دەست بەریتانیا لەجیاتی تورکیا.

**ماددەی (١١٠):**

مومتەلەکەکانی تورکیا لە میسر دە گوازرێتەوە بۆ تورکیا بێ کرێ.

**ماددەی (١١١):**

هەرچی سەروەرت و سامانی گواستراوە و نەگوێزراوەی ئەو تورکانە هەیە کە مافی نیشتەجێبوونیان لەمیسر پێنەدرا ، دەبێ بەپێی (پشکی ئابوری) رێکەتننامەکە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

**ماددەی (١١٢):**

لەبارەی رێکخستن و دابە شکردنی قەرزەکانە لەنێوان تورکیا و میسری نوێ.

# سودان

**ماددەی (١١٣):**

لەبارەی چارەنوسی سودان بۆ بەدەوڵەت بوون و جیاکردنەوەی لە میسر.

**ماددەی (١١٤):**

سودانیەکانی دەرەوە مافیا ن لە کۆنسولیەی بەریتانیا هەیە بۆ پێویستی.

# قوبرس

**ماددەی (١١٥):**

هەموو لایەك دان بەوە دەنێن کە قوبرس لەژێر دەستی بەریتانیایە لە ٥/ ١١/ ١٩١٤–وە

**ماددەی (١١٦):**

مافی تورکیا بەسەر قوبرس نامێنێ.

**ماددەی (١١٧):**

هاوڵاتی قوبرس ناسنامەی بەریتانی وەردەگرن لەجیاتی تورکی.

**بەشی دەیەم :**

# مەغریب و تونس

### ماددەی (١١٨):

تورکیا دان بە پارێزگاری فەڕەنسا لەسەر مەغریب دەنێ لە ٣٠/مارس ١٩١٢–وە.

### ماددەی (١١٩):

ئەو کەلوپەلە مەغریبیانەی دێتە ناو خاکی تورکیا وەك فەڕەنسی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێ.

### ماددەی (١٢٠):

تورکیا دان بە پارێزگاری فەڕەنسا لەسەر تونس دەنێ لە ١٢/مایۆ ١٨٨١–ەوە ، هەروەها کەلوپەلەکانی تونس کە دێنە تورکیا دەبێ وەك فەڕەنسی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ.

# لیبیا و دورگەکانی ئیجە

### ماددەی (١٢١):

مافەکانی تورکیا لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٢–وە بۆ سوڵتانی لیبیا بەجێ دێڵا.

### ماددەی (١٢٢):

تورکیا واز لە کۆمەڵێك دورگە دەهێنێ بۆ ئیتالیا لە ئیجەوە تا کوسی).

ناسنامەی مەدەنی:

### ماددەی (١٢٣) و (١٢٤):

لەبارەی پێدانی ناسنامەی مەدەنیە بۆ ئەو کەسانەی لە وڵاتانی جیابوویەوە لە تورکیا.

### ماددەی (١٢٥):

ئەو کەسانەی کە لە (١٨) ساڵی تێپەڕیان کردووەو ناسنامەی جیایان هەیەو لەسەر خاکی عوسمانی ژیاون ، بەپێی ئەو پەیماننامە بۆیان هەیە لە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەی د روست بونە بە ئارەزوی خۆیان وڵاتێك لەوانە ئەرمینیا ، ئازەربێجان ، جۆرجیا ، یۆنان ، حیجاز ، میزۆپۆتامیا ، بولگاریا ، تورکیا هەڵبژێرن ئەگەر لەگەڵ زۆرایەتی دانیشتوانەکە یەك رەگەز بوون.

### ماددەکانی (١٢٦، ١٢٧، ١٢٨):

سەبارەت بە تاوتوێکردنی پێدانی ناسنامەو مافی گواستنەوەو تۆمارکردنە.

### ماددەی (١٢٩):

ئەو یەهودیانەی ناسنامەی عوسمانیان نیەو تیاشیدا ژیاون ، بەپێێ ماددەی (٩٥) ، هەرهەموویان ئۆتۆماتیکیانە دەبنە هاوڵاتی فەلەستینی...

### ماددەی ( ١٣٠، ١٣١):

تەواوکاری ئەو پێویستیانەی ناسنامەیە.

## حوکمە گشتییەکان:

### ماددە (١٣٢):

بەپێی ئەو پەیماننامەیە ، تورکیا واز لە هەموو ئەو خاك و زەویانەی بەدەر لە تورکیا دەهێنێ لە هەموو ماف و ئەدرێسێك بۆ هێزە هاوپەیمانەکان.

تورکیا بەڵێن دەدا دان بە هەر تاوتوێك بهێنێ کە ئێستا دەکرێ لەو خاکانەیان لە داهاتوو لەلایەن وڵاتانی هاوپە یمانانەوە هەرکاتی پێویست بکا لەگەڵ هێزێکی سێیەم بۆ ئەوەی دەقەکەی سەروو بشێت بۆ جێبەجێ کردن.

### ماددە (١٣٣):

ئاماژە بە دان پێهێنانی تورکیا بە ئەحکامی پەیماننامەکانی تری ئاشتییە کە لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیمانی تورکیا کرا.

### ماددەی (١٣٤):

تورکیا دان بەو سنورانە دەنێ کە لە ئەڵمانیا و نەمسا و بولگاریا و بۆتان و هەنگاریا و پۆڵەندا و رۆمانیا و سربیا و کرواتیا و سلۆڤینیا و چیکۆسلۆڤاکیا.

## ماددەی (١٣٥):

تورکیا دان دەبێ بەو هەموو پەیماننامە و رێکەوتننامانەی هاوپەیمانەکان لەگەڵ وڵاتانی پێشتر هەبووە یان تازە دروست بووە لە ئەمپراتۆریەتی پێشووی روسیا ، هەروەها تورکیا دان بە سەروەری ئەو دەوڵەتانەی ناو ئەمپراتۆریەتی روسیا (یەکێتی سۆڤیەت) دەنێ.

## ماددەی (١٣٦):

ئاماژەیە بە پێکهێنانی لێژنەیەك بۆ دەستنیشانکردنی باری دادگایی لە تورکیا.

## ماددەی (١٣٧):

تایبەتە بە (سزاکان) نابێ هیچ نیشتەجێبوێکی تورکی بە هیچ بیانویەك نیگەران و بێزار بکرێ لەسەر کارێکی سیاسی یاخود سەربازی یان هەر هاریکارییەکی هاوپەیمانانی کردبێ یاخود هاونیشتمانیان کردبێ لەماوەی نێوان (١)ی ئابی ١٩١٤ هەتا جێبەجێ کردنی ئەم رێکەوتننامەیە ، سزابدرێ لەسەر ئەو جۆرە کارانەی سەرەوە.

## ماددەی (١٣٨):

هیچ کەسێکی دانیشتوی ئەو ناوچانەی لە تورکیا جیابونەتەوە بەپێی ئەم رێکەوتننامەیە نابێ نیگەران و بێزار بکرێن لەسەر هەڵوێستی سیاسییان لەپاش (١)ی ئابی ١٩١٤ یان بەهۆی راگەیاندنی رەگەزنامەکەی بەگوێرەی ئەو رێکەوتننامەیەی سەرەوە.

## ماددەی (١٣٩):

تورکیا بەرەسمی دەستبەرداری هەموو مافێکی (دەرەبەگایەتی و دادوەری) سەر ئەو موسڵمانانەی کە دەکەونە ژێر سەروەری و پاراستنی دەوڵەتی ترەوە ، نابێ هیچ چێزێك (گوشارێك) راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەلایەن دەسەڵاتی تورکییەوە دەرهەق ئەو کەسانە یان دەوڵەتانە بەکاربێ کە لە تورکیا جیابونەتەوە.

# پاراستنی کەمایەتیەکان:

## ماددەی (١٤٠):

تورکیا بەڵێن دەدات کە بەهیچ جۆرێك پێشێلی ماددەکانی ١٤١، ١٤٢، ١٤٧ نەکات.

## ماددەی (١٤١):

تورکیا بە تەواوی بەڵێن دەدا بۆ پاراستنی ئازادی بۆ هەموو دانیشتوانی تورکیا بێ گوێدانە جیاوازی لە ڕەچەڵەك و زمان و ئایین.

## ماددەی (١٤٢):

لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی تورکیا لە ١/ نۆڤێمبەر ١٩١٤ تیرۆری کردووە ئەوا هەر گۆڕینێکی ئایینی بۆ ئیسلامەوە ناشەرعیە ، دەبێ ئینتمای ئایینیان وەك پێش ئەو بەروارە بگەڕێتەوە و بە تەو اوی ئازاد بکرێت و تەواوی مافە زەوتکراوەکانیان بگێڕدرێتەوە.

## ماددەی (١٤٣):

لەبارەی گێڕانەوەی خەڵکە دەرکراوەکانی کەمایەتیەکانە، هەروەها بۆ ڕێکخستنی و ئاڵۆوگۆڕی دانیشتوانی تورك و یۆنانە بۆ هەردوولا.

## ماددەی (١٤٤):

لەبارەی گێڕانەوەی ئەو کەمایەتیانە ی ماڵ و موڵکیان لێ داگیرکراوە.

## ماددەی (١٤٥):

هەموو خەڵکی تورکیا یەکسانن بەرامبەر یاسا ، هەروەها هەموو لایەکیش ئازاد دەبن لە بەکارهێنانی زمانیان ، بەشداری لە هەڵبژاردن و بە ئەندازەی خۆشیان نوێنەرایەتیان هەبێ.

## ماددەی (١٤٦):

لەبارەی دان هێنانی تورکیایە بە بڕوانامەکانی بیانیەوە.

### ماددەی (١٤٧):

لەبارەی ئازادی بەکارهێنانی زمانی هەر کەمایەتیەکە لە خوێندن لە دام و دەزگا زانستیەکاندا.

### ماددەی (١٤٨):

لەو شار و ناوچانەی کە ئەو کەمایەتیانە زۆرایەتی پێك دەهێنن دەبێ بە دادگەڕیانە بەشیان لە داهات و خزمەتگوزاری پێ بدرێ.

### ماددەی (١٤٩):

لەبارەی خوێندنی ئاینیە لە کەنیسەکان.

### ماددەی (١٥٠):

لەو ناوچانە و شارانەی کە کەمایەتی ئاینی (غەیرە ئیسلام) لێ زیادە نابێ تۆبزیان لێ بکرێ لە پابەند بوون بە شەعائیرەئیسلامیەکان .

### مادەی (١٥١):

تورکیا قایلە بە هەر تاوتوێك لەنێوان هاوپەیمانان و کۆمەڵەی گەلان سەبارەت بەو ئەحکامانەی سەروو.

### لەماددەی (١٥٢) هەتا مادده (١٦٤):

سەبارەت بە دیاریکردن و سنوردانان بۆ قەبارەی هێزی چەکداری تورکیا لە هەردوو بەشی دەرەك و سوپا ، بەجۆرێك سوپای تورکیا لە ٥٠,٠٠٠ کەس تێنەپەڕی وەك لە مادەی (١٥٥) و (١٦٤) هاتووە تەنانەت ژمارەی پاسەوانانی سوڵتانیش دیاریکراوە.

### لە ماددەی (١٦٥) هەتا ماددەی( ١٦٩):

هەر درێژکراوەی بەشە عەسکەریەکەی تورکیایە و باس لە چۆنیەتی داڕشتنی پەیڕەوی ناوەخۆ و بەرپا کردنی هەردوو جۆری سیستەمی (تەجنید) و (خۆبەخش) بۆ هەموو لایەك.

### ماددەی (١٧٠):

سەبارەت بە باج و گومرگە بۆ تورکیا.

### لە ماددەی (١٧١) هەتا ماددەی ( ١٧٦):

سەبارەت بە چەك داماڵینی هێزەکانی تورکیایە و تەسلیمی بە هاوپەیمانان دەکاو لە کارگەکانیش نابێت چەکی قەدەغەکراو دروست بکا و ئەو جۆرە کارگانە بکا بە کارگەی بازرگانی ، هەروەهاش کڕینی چەکیشی بۆ دیاری بکرێ.

**ماددەی (١٧٧) هەتا (١٨٠):**

سەبارەت بە چەك داماڵینی و هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگای سەربازی تورکیا لەسەر دەریا و سنوری ئاسیاوی و ئەوروپیەکەی.

## دەریایی

**ماددە ١٨١-١٩٠:**

بۆ داماڵین و سنوردارکردنی چەکی دەریاییە لەبەلەم و غەواسەو کەشتی گەورە، دروستکردن و بەکارهێنانی بێ تەلیش دەگرێتەوە.

## ئاسمانی

**لە ماددە (١٩١ هەتا ١٩٥):**

سەبارەت بە چالاکی ئاسمانیە لە فڕۆکەو کۆپتەر و تیایدا هاتووە فڕۆکەکانی هاوپەیما نان بە تەواوی ئاسمانی تورکیا دەسوڕێنەوە هەتا هێزە هاوپەیمانەکان لە تورکیا دەردەچن و لەو ماوەیەش جموجۆلی ئاسمانی تورکیا و بەهێزکردنی دەوەستێ بۆ ماوەی شەش مانگ.

**لە مادەی ١٩٦-١٩٩:**

هەر لە بارەی دانانی چاودێریە لە بارەی ئەحکامەکانی سەروو بۆ چەك کردنی سوپای تورکیا.

**ماددەی (٢٠٠-٢٠٥):**

بۆ چاودێری هێزی سەربازی تورکی و زانیاری پێدانە بۆ جۆرەکانی چەك لە وشکایی و دەریایی و ئاسمانی سوپای تورکیا بۆ بە ئەندازەی ئەو هەرێمەی بۆی دەمێنێتەوە.

# ئەحکامە گشتیەکان

## لە ماددەی (٢٠٦) هەتا (٢٠٧):

سـەبارەت بـە ماددەکـانی وەسـتانی شـەڕ جـەنگی جیهـانی یەکـەم بـوو لەگـەڵ عوسمـانی لـە ٣٠/ ئۆکتۆبـەری ١٩١٨ (بـە ئاگربەسـی مـورس بەناوبانگـە) ، هـەروەها تورکیا نەتوانێ لەگەڵ وڵاتێکی تری بیانی هاوکاری بکا.

## لە ماددە (٢٠٨ تا ٢١٦):

سەبارەت بە دیل و کەلوپەلەکانیانە هەروەها مافی گەڕانەوەیان بۆ وڵاتـی خۆیـان لەسەر حسابی تورکیـا ، دەبـێ تورکیـا ری بـەدیلکراو و دورخراوەکـانی تورکیـاش بـدا بگەڕێنەوە نێو تورکیا بێ ئەوەی سزایان بدا.

## مادەی( ٢١٧):

لایەنـە باڵاکـان دەسـتبەرداری هـەموو ئـەو بڕەپارانـە دەبـن کـە لـە ڕۆژی پێـدانی دیلەکانی جەنگ خەرجیان کردووە.

# گۆڕەکان

## ماددەی (٢١٨ هەتا ٢٢٤):

سەبارەت بە گۆری ئەو سەرباز و پلەدارانە یەکە لەو جەنگە تێچووینە بۆ چۆنیەتی پاراستنیان و گێڕانەوەیان و کارئاسانی دۆزینەوەیان.

## مادەی( ٢٢٥):

گۆڕی دیلەکانی جەنگ یاخود گیراوە مەدەنیەکانی گەلانی جیاوازی سـەرانی شـەڕ دەبێ بە دروستی بەپێی ماددەی ٢٢٤ بپارێزرێت.

# سزاکان

## ماددەی ٢٢٦ هەتا ٢٣٠:

سەبارەت بە دادگایی کردنی ئەو سەرکردە سەربازیانەی تورکیایە کـە داواکـراون و تـاوانی جـەنگیان هەیـە ، یـاخود لەمیانـەی جـەنگی جیهـانی ١٩١٤-١٩١٨ تـاوان و

کوشتاریان کردووە ، دەبێ تورکیا هەموویان بە بەڵگەنامەوە تەسلیم بە دادگاکانی ئەو وڵاتانە بکا کە داوایان کردوون ، ئەو حوکمە هاوڵاتی ئەو وڵاتانەش دەگرێتەوە کە لە تورکیا وا جیادەبنەوە ، تورکیاش دان بە سەرەنجامی دادگا بڕیار و جۆری سزاکە رازی دەبێ.

# قەرەبۆی جەنگی:

## ماددەی (٢٣١- ٢٥٧):

سەبارەت بە قەرەبۆی جەنگیە دەکەوێتە سەر تورکیا وەك چۆن ئەڵمانیا و نەمسا و مجر هەریەکە بە رێکەوتنێکی وا ئەو قەرەبۆیەی جەنگ دەدەن ، بەشێك لەو قەرەبۆیە جەنگی عوسمانی دەکەوێتە سەر ئەو وڵاتانەی وا لێی جیادەبنەوە.

## ماددەی (٢٥٨-٢٦٨):

لەبارەی پەیوەندی دەریایی تورکیا و ئەڵمانیایە و چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ناوەرۆکی ئەو ماددانەی سەرەوە.

# پەیماننامەکان:

## ماددەی (٢٦٩ هەتا ٢٨٠):

سەبارەت بەو رێکەوتنە دوەلیانەی پێشووە کە لەسەدەی ١٩-٢٠ کراوە تا تورکیا پێیوە پابەند بێت ، لەوانە رێکەوتننامەکانی بەریدی ، گواستنەوە، بروسکە ، هەندێ رێکەوتنی تری نوێش دەکرێ لەبارەی ماکێن و ئۆتۆمبێل و سکەی شەمەندەفەر و هەندێ ئاماری گشتی و کارە مرۆییەکانی تر و پاراستنی تەندروستی و پەینی زەوی و زار ، هەروەها چوارچێوەیەکیش دابنرێ بۆ تورکیا لێی دەرنەچێ لە مۆرکردنی رێکەوتننامە دوەلیەکان ، هەروەها هەموو ئەو رێکەوتنانەی لەگەڵ (ئەڵمانیا ، نەمسا ، بولگاریا ، مەجەر) کردووە لە ١/ئۆگستی ١٩١٤ هەڵدەوەشێتەوە.

### ماددەی ٢٨١ تا ٢٨٦:

سەبارەت بە گێڕانەوەی مافی کۆمپانیا و ئەو کەس و بیانیانەیە کە لەو جەنگە لە سنوری تورکیا زەڕوزیانیان وەبەرکەوتوە.

## موڵکیەت و ماف و بەرژەوەندی تر

### ماددە ٢٨٧-٣٠٣:

سەبارەت بە زەرەر و زیانە گشتیانەیە ئەوانەی لەنێو خاکی تورکیا وەبەرهێنان و کاری گشتییان کردووە، هەروەها ئەو قەرزانە بەنرخی دراوی پێش جەنگ کە دووچاری دابەزین نەببوو ، ببژێردرێتەوە.

## گرێبەستەکان:

### ماددەی (٣٠٤-٣٠٩):

لەبارەی ماف و سەرەنجامەکانی گرێبەستەکانی تاك و کۆی کۆمپانیا و هاوڵاتیانی وڵاتانی هاوپەیمانانە و ئەو وڵاتانەی لە تورکیا جیاکراینەوە.

## کۆمپانیاو ئیمتیازەکانی

### ماددەی (٣١٠-٣١٧):

لەبارەی مافی کۆمپانیاکان و زەڕوزیان لێکەوتووەکانیانە و هەموو ئەو ئیمتیازانەی وڵاتانی تەوەریش لەسەر خاکی تورکیا هەڵدەوەشێنێتەوە ، یان دەکەونە ژێر دەسەڵاتی هاوپەیمانان.

## ئاسمانی

### ماددە (٣١٨-٣٢٧):

لەبارەی مافی فڕین و رەتبوونی فڕۆکەکانی هاوپەیمانانە بەسەر خاك و ئاوی تورکیا و هەروەها نیشتنیشی لە فڕۆکەخانەکانی چ ئەوەی هەیە چ ئەوەی تازە دروست دەکرێ ، هەموو ئەو بەندانە بەسەر تورکیا دەسەپێندرێت تا دەچێتە نێو کۆمەڵەی گەلانەوە.

# دەربەند و بەندەر و سكەی ئاسنی و مافە گشتی و جۆربەجۆرەكانی تر

### مادده (٣٢٨ تا كۆتایی ماددەی ٤٤٣:

لەبارەی رێپێدانی توركیایە بە هاتوچۆی دەریایی و ئاسنی بی قەدەغە دەتوانێ جۆرێك لە باج وەرگرێ و لە ماددەكانی دوایش ئەحكامەكانیەتی و پاراستنی سكەی ئاسنی و كابیلەكانی پەیوەندی و تەلەفۆنی و بەریدی و.. تا دەگاتە پاراستنی سەرچاوەی ئاوو ئاوەدانی دیواری ئاودێری ، هەروەها بە پابەندبوونی توركیایە بە رێكەوتنەكانی سەبارەت بە بازرگانی كردن بە چەك و تەقەمەنی و خواردنەوە كحولیەكان و.. تا دەگاتە پابەندی بە (موادی ئەسەری) لە كتێب و ماددەی داتاشراوو خەزێنەو بەڵگەنامە.

لەدوا ماددەی (٤٣٣) باس لە بوار هەبوون بۆ هاتنە ناو ئەو رێكەوتنەی روسیاش دەكا ، رێكەوتنەكە لەگەڵ جاڕدانی ئەكتیڤ دەبێ.

## لە كۆتایی دا

ئەم رێكەوتننامەیە لە شاری سیڤەر لە ١٠/ ئابی ١٩٢٠ مۆر كرا ، دەقی رێكەوتننامەكەش دەنێردرێتە ئەرشیفی كۆماری فەڕەنسا و دوایش بەفەرمی كراوی دەنێردرێتە ئەو وڵاتانەی مۆریان لەسەر كردووە.

## وەرگێر لە چەند دێڕێکدا :

سەلام ناوخۆش بەکر

١ – لە ساڵی ١٩٦٦ لە دێ ی زێبارۆك – هەولێر لە دایك بووە .

٢ – لە ساڵی(١٩٨٧) ەوە نووسین لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بڵاودەکاتەوە .

٣ – هەتا ئێستا نزیکەی (٣٠) سی کتێبی لە بوارە جیا جیاکانی (فەرهەنگ، هزر، زمانەوانی، مێژووی سیاسی، وەرگێران) بڵاوکردۆتەوە .

٤ – لە چەندەها کۆنفڕاسە زانستیەکانی زانکۆکانی هەرێم بەشداری کردووە .

٥ – ئێستا پرۆفسیۆری یاریدەدەرە لە زانکۆی سەلاحەدین و قوتابی دکتۆرایە لە بەریتانیا .

## بڵاوکراوەکانی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان:

١/ هەڵەبجە و پەرلەمان

٢/ کاروچالاکییەکانی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان

٣/ پەرلەمانتارانی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەپەرلەمانی عێراقدا

